# مەتەڵ و موعەمما

## ئیبراهیم ئەحمەدی

| | |
|---|---|
| سرشناسه: | احمدی، ابراهیم، ۱۳۳۳- |
| عنوان پدیدآورنده: | مه ته ل و مو عه مما/ ئیبراهیم ئه حمه دی ؛ هه له گر ره حیم لوقمانی |
| مشخصات نشر : | سنندج : انتشارات علمی کالج ، ۱۳۸۹ |
| مشخصات ظاهری : | ۱۹۳ ص . : مصور ، جدول ، نمودار |
| شابک : | ۸- ۰۸- ۵۸۲۷ - ۶۰۰- ۹۷۸ |
| وضعیت فهرست نویسی : | فیپا |
| موضوع : | افسانه ها و قصه های کردی ، ضرب المثل های کردی، چیستان های کردی. |
| شناسه ی افزوده : | لقمانی، رحیم، ۱۳۳۷ - ، ویراستار |
| رده بندی کنگره : | ۱۳۸۹ ۳۶الف ۲۵آ / PIR ۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی : | ۹/۲۳ فا ۸ |
| شماره‌ی کتابشناسی ملی : | ۲۱۱۷۹۲۴ |


انتشارات علمی کالج

انتشارات علمی کالج

# مەتەڵ و موعەمما

ئیبراهیم ئەحمەدی


چاپ اول 1389
ناشر انتشارات علمی کالج
مدیر مسئول کیومرث کرباسی
طرح روی جلد حمیدرضا زری
حروفچینی سمیه تیموری
چاپ و لیتوگرافی سیمرغ
شمارگان ۲۰۰۰ نسخه
قیمت ۳۵۰۰ تومان



مرکز پخش : سنندج ، خ پاسداران ، مجتمع تجاری کردستان ، طبقه همکف ، واحد ۱۶۲- ۱۶۱
تلفن : ۳۲۹۱۰۸۶ - ۳۲۳۷۲۳۷ فکس : ۳۲۳۵۷۹۶
collegepublication@yahoo.com

# ناوەرۆك

## پێشەکی:

لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا مرۆڤ بۆ بژیوی ژیان بەردەوام لەگەڵ سروشت و دیارەکانیدا لە کێشە و بەربەرەکانێدا بووە. لە رەوتی بەردەوامی خەبات و کێشەی مرۆڤ لە کاردانەوەی شکست و خەم و سەرکەوتن و شادییەکانی خۆی، جۆرەکانی هونەری ئافراندووە. گۆرانی و شیعر کۆنترین دیاردەی هونەر و ئەدەبی مرۆڤی سەرەتایین. هونەر و ئەدەبی زارەکی راستەوخۆ زادەی کار و ئامرازی وەبەرهێنان و چالاکی رۆژانەی ئینسانە. هەر بۆیە هەموو کەرستەکان و دیاردەکانی کار و سروشت لە ناو ئەدەبی ساکاری زارەکیدا رەنگی داوەتەوە.

دەتوانم بێژم هونەر و ئەدەبی زارەکی بەرهەمی ژیانی خەڵکی کارەکەر و بن دەستن. لە سۆزی گۆرانییەوە بگرە تا کینایە و مەتەڵ و... رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی ئاوازی دەروون و ئازاری لەش و تاڵی و شیرینی و ئەزموونی ژیانی پێوە دیارە. هۆی مانەوەشی ئەوەیە کە چینی هەژار و گەورەی کۆمەڵگا بە زمان و ئەزموونی خۆی دەزانێ و لەگەڵ خەون و خەیاڵەکانیدا پشتاوپشت پاراستوویە. بەڵام چینی ژووردەستی کۆمەڵگا چون لە فێرگەی کار و سروشت و ئازارەکان بە دوور بووە، نەیتوانیوە بە جۆرێ پێویست داهێنەری هونەر و ئەدەبی تایبەتی خۆی بێ و لەگەڵ رەوتی زەمان بیپارێزێ. ئەگەریش هەبووبێ

دوور لە ڕۆحی کۆمەڵ و ڕاستییەکانی ژیان بووە.

کۆکردنەوە و خوێندنەوەی هەر بەشێکی ئەدەبی فولکلۆر بەو واتا نییە بکرێتە سەرچاوەی ئەدەبی مۆدێرن و درێژەدەری ئەو جۆرە بیرۆکە و زمانە سواوە بین، بەڵکوو بە شیکردنەوە و تواکردنەوەیان دەتوانین لە زۆر لایەنی زمانەوانی، فەرهەنگی، مێژوویی، ئابووری، رامیاری، دەروونزانی، باوەڕمەندی، بیری خورافە و... کۆمەڵگای رابردوومان بناسین.

مەتەڵ بە سیمای ئەدەبی فولکلۆری هەموو میللەتانەوە بەدی دەکرێ. گەلانی ژیر و بەختەوەر هەموو بەشەکانی ئەدەبی زارەکییان گواستووەتەوە بۆ ناو کتێب و کتێبخانەی خۆیان پێ دەوڵەمەند کردووە. لەم بابەتەوە دەتوانم بێژم هێشتا ئێمە (بە بڕوای من) وەك گەلێکی بێ کتێب دەژین چونکە کتێب پێناسە و شوناسی زمان و خاك و فەرهەنگی نەتەوەیە.

گەلی بێ کتێب هەمیشە بەردەست و پێشێلی گەلی دەسەڵاتدار بووە و لە باری ئابووری و زمانەوە لەسەر خاکی خۆیشیان بەردەوام دەستندەخۆر و شانکزی گەلی باڵادەست و حاکمە. ژینۆسایدی فەرهەنگی و زمانی وای لێدەکەن باوەڕی بە کەسایەتی نەتەوەیی خۆی نەمێنێ و زمان و شوناسی خۆی بە لاوەکی و نازانستی و دواکەوتوو بداتە قەڵەم.

بەهەر حاڵ، کۆکردنەوەی هەر بابەتێکی فولکلۆری بۆ ناسین و توێژینەوەی لایەنە شاراوەکانی بیر و ژیان و سەربوردەی کۆمەڵگا کارێکی گرنگ و بەنرخە.

بەم بۆنەوە کارەکەی کاك برایم ئەحمەدی جێی سپاس و دەستخۆشییە. رەنگە زۆربەی ئەم جۆرە مەتەڵانە لە ژیانی مۆدێرن و پێوەندی لەگەڵ ئامرازی مۆدێرنی ئەمڕۆدا کارابیان بە شێوەی رابردوو نەبێ، بەڵام کۆکردنەوە و شیکردنەوە و پاراستنیان لە زۆر بارەوە کارێکی پێویستە.

لێرەدا من نامەوێ ئەندێشەی گەورە و فەلسەفاوی بدەمە پاڵ بیرۆکەی رابردووان و هەموو شتێکیان بە شاکار و ئەندێشەمەندانە بزانم. لە راستیدا وەك میراتگری کولتووری شارستانییەتی مێزۆپۆتامیا دەبوو هەڵگری زۆر بیری فەلسەفی و ئەندێشەی پێشکەوتووانە بوایەتن. دەکرا لە جیاتی هەندێ لەو قسەڵۆك و مەتەڵۆکانە رۆشنایی فکر و رێنمایی شیاویان بۆ داهاتووان دیاری بکردایە؛ بێگومان ژیانی ئەمڕۆی ئێمەش جۆرێکیتر دەبوو...

هەرچەند زۆربەی مەتەڵەکان هەڵگری جۆرێك بیری کۆمەڵایەتی و ئابووری و...ن بەڵام دەمەوێ چەپکێ گوڵی ئاوێتە بە بۆنی گلەیی لەسەر گلکۆی نادیاری خوێندەوار و گەورەکانی رابردوومان دانێم.

ئەمە لە کاتێکدایە کە لە هەندێ خێزگە و شارستانییەتی کۆندا دەیان بیرمەند و فەیلەسووفی گەورە سەریان هەڵداوە کە بەردەوام دژایەتی دواکەوتوویی و نەخوێندەواری کۆمەڵگای خۆیان کردووە. بۆ نموونە پرۆسەی رۆشنگەری و ئەندێشەی ئەدەبی و فەلسەفی یوونانی کۆن لە ئاکامدا دیوارەکانی خورافە و دەسەڵاتی کلیسای رووخاند و بوو بەهۆی ژیانەوەی ئەورووپاییەکان. نەتەوەی وا هەبوون لە ئێمە بندەستتر، ستەمدیدەتر کە شارستانییەت و نیشتمانی پان و بەرینیان نەبووە، کەچی لە ژیانی دەربەدەری و ژینۆسایدی خۆیشیاندا دەیان پیاوی زانا و بیرمەند و فەیلەسووفی جیهانییان تێدا هەڵکەوتووە و بە رۆشنایی فکریان زۆر تاریکستانی جیهانیان رووناك کردۆتەوە! بەڵام زۆرێك لە خوێندەوار و گەورەکانی رابردووی ئێمە وایان لێکراوە بە گیان و دڵ خزمەتی زمان و کولتووری خۆیان نەکەن و خەڵك بۆ قسەی پڕوپووچ و نازانستی و قەناعەت هان بدەن؛ بە داخەوە ئەمەش هیچ نرخێکی بۆ زمان و فەرهەنگ و داب و نەریتی ئێمە نەبووە! بۆیە گلەیی لە خوێندەواری رابردوو دەکەم چونکە داهێنەری زۆربەی مەتەڵەکان لە رووی کێش و سەروا و ریتمی وشەکانەوە کاری خوێندەوارە. لە ژیانی ساکار و هەژارانەی رابردوودا، ئامانجی ئەو شاعیرە نەناسراوانە، سەرگەرم کردنی خەڵك و هاندان بۆ بیرکردنەوە لە مەسەلەیەکی سادە و ئاسایی رۆژانە بووە، دەیانتوانی هەر بەو مەتەڵە سادانەش جۆرێك رۆشنگەری و بیریاری کۆمەڵایەتی زیاتر بدەنە فکری بێکاری کۆمەڵگاوە.

بە هەر حاڵ گلەیی و گازندەی ئەمڕۆی ئێمە بۆ رابردووانمان کاتێ بەسوودە کە خۆمان بتوانین بیرمەندێکی زانا و ئازا و داهێنەرێکی سەردەمییانەی زۆر پێشکەوتوو بین کە بتوانین درگای رۆشنگەری و جیهانبینی تازە و تازەتر بۆ بەرەکانی داهاتوو بکەینەوە.

لێرە لە خوێندەواری وشیاری گەلمان دەخوازم بە دید و خوێندنەوەی جیاواز لەم مەتەڵانە بڕوانن و بیاندەنە بەر سەرنجی شیکردنەوە و پاڵاوتنی زانستیانە. چونکە چاك بن یان خراپ موڵکی ئەدەبی فولکلۆری خۆمانە. بۆ ناسینی باشتری رابردووی خۆمان دەتوانین لە زۆر دیدگای زانستیانەی جیاوازەوە لێیان بڕوانین. مەتەڵ لە باری زمانەوە دەتوانێ هەڵگری زۆر وشەی رەسەن و دەگمەن بێ کە رەنگە بەرەی تازەی شارستانی نەیبیستبێ و نەیدیبێ.

♠ بۆ ناسینی کەرستەی کار و ژیان و جۆری ژیواری فکری و مادی رابردووان سەرچاوەیەکی باشن.

♠ ناسینی روانینی خەڵك بۆ سروشت و رووداوەکان و ژیان و ژینگەی خۆیان مەتەڵەکان پیشانمان دەدەن کە خەڵك بە زۆری وابەستەی هەندێ خواردنی تایبەت بەخۆیانن کە بەرهەمی گژ و گیا و ئاژەڵانی

خۆیانە وا دەردەکەوێ کە پێوەندییان لەگەڵ گەلانی‌تر و دنیای دەرەوەی خۆیان زۆر نەبووبێ.

♠ پیشاندانی رەنگدانەوەی فکری و هەندێ لایەنی خورافە و بنەماکانی فکر و ژیان و ئەندێشەی گشتی کۆمەڵگا.

♠ هەندێ لەم مەتەڵانە لە رووی بڕگە و ریتمی وشە و کێش و سەرواوە (وزن و قافیە) بەشێکن لە بنەماکانی شیعری فولکلۆری کوردی کە لەسەر کێش ٥ و ٤ و ٣ برگەیی پێك هاتوون و نموونەی ئەو جۆرە ریتمە لە گۆرانی و بەیت و شیعری ئایینی و فولکلۆریدا زۆرە. بێگومان ئەو دەستە مەتەڵانەی بە ش و سەرواترن لە رووی زەمانەوە کۆنترن و...

لە کۆتاییدا سپاسی دووبارەم هەیە بۆ کاك برایمی ئەحمەدی و هیوادارم لە هەوڵەکانی داهاتوویدا بە ئەزموونێکی باشترەوە بۆ روونکردنەوەی هەمە لایەنتر یەکێ لە زاراوە یان دیالێکتەکان هەڵبژێرێت. چونکە کورد، چەن زمانی سەرەکی و گەلێك دیالێکت و زاراوەی جۆراجۆری هەیە و کار کردن لە هەر بوارێکی فولکلۆری ئەدەبی هەموو زاراوەکان بە کەسێك و دوو کەس ناکرێ و دەبێ هەوڵی گشتی بۆ بدرێ هەتا بەرهەمێکی پوختەتر و کامڵتری لێ بکەوێتەوە.

هیوادارم ئەم هەوڵەی کاك برایم ببێتە هاندەری رۆشنبیری خەمخۆری سەر بە دیالێکت و زاراوەکانی‌تر کە فولکلۆر و مەتەڵی ناوچەکانی خویان کۆ بکەنەوە لە فەوتان رزگاری بکەن.

سەرەڕای ئەم پەیڤانەی سەرەوە کۆکردنەوەی ئەو ژمارە مەتەڵانەی کە سەر بە زاراوەی کرمانجی ژووروو، لوڕی، لەکی و شێوەزمانی هەورامی ئەرك و تێکۆشان و دڵسۆزی کاك برایم پیشان دەدەن کە دیارە دڵەڕاوکێ و پاراستنی کەلەپووری هەموو پاژ و لایەنەکانی‌تری گەلی کوردی لە دڵدایە.

هیوادارم خوێندەواری زانا و بیرمەندی ئەمڕۆمان زیاتر لە بیری دۆزینەوەی گەلی خۆیاندا بن تا زیاتر ببینە گەلی خاوەن پێناسەی کتێب و زووتر بە ئاواتەکان بگەین.

**رەحیم لوقمانی - ٨٩/٤/٣٠ سنە**

## شێوەی داڕشتن و کۆکردنەوە:

لەم ساڵانەدا جێگەی مەتەڵم لە نێو دەقەکانی فولکلۆردا خاڵی بینی، تەنانەت بەرهەمێکم لەم بوارەدا لە نێو کتێبخانەکانی شاری سنەدا بەرچاو نەکەوت؛ دەمزانی فولکلۆری کوردی لەم بوارەدا زۆر دەوڵەمەندە و تەنیا جاروبارێك لە برێك لە گۆڤارەکاندا چەند دانە مەتەڵێکم دەبینی وا هەستم کرد کە خەریکە لە زۆر ناوچەدا لە بیر ئەچێتەوە. بەڵێنم دا لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەلی لەسەر بکەم و بە دوو شێوە کەوتمە کۆکردنەوەی مەتەڵەکان.

**یەکەم:** شێوەی مەیدانی و دەماودەم بوو کە سەرەتا لە مرۆڤی لێهاتوو وەکوو پیرەپیاوان و پیرەژنانی بەتەمەن و ساحیب ئەزموونی ناوچەی لەیلاخ و سنە کە ئەم دوو ناوچە سەر بە زاراوەی ئەردەڵانین دەستم پێ کرد، ئەم بەڕێزانە مەتەڵیان بۆم دەگوت و تۆمارم دەکرد و دووبارە دەمنووسییەوە. زۆربەی مەتەڵەکان سەر بە دیالێکتی سۆرانی زاراوەی ئەردەڵانین. دوایی لە مەتەڵی ناوچەکانیتر وەکوو: سەقز، مەریوان، هەورامان، کرماشان و لوڕستان کەڵکم وەرگرت.

**دووهەم:** شێوەی کتێبخانەیی بوو کە کەڵکم لە چەن سەرچاوەیەکی بەنرخ وەرگرت کە تایبەت بە ناوچەکانیتری کوردستان بوون. سەرەڕای ئەوە کە ئەم خاوەن بەرهەمانە لە کاتی خۆیاندا هەوڵیان داوە بۆ

کۆکردنەوەی مەتەڵەکان دەستیان خۆش بێ بەڵام بەرهەمەکانیان ناوچەیین و بە شێوەیەکی گشتی نین زۆر بەرتەسك و کورتن و بە شێوەیەکی ورد و زانستیانە لێکۆڵینەوەیان لە سەر نەکردووە تەنانەت برێك لەم بەرهەمانە لە پێشەکی و سەرچاوە بێوەرین و بەڵام برێکی‌تریان بەرهەمێکی بایەخدار و باشیان پێك هێناوە دیسان ئەم بەرهەمانە ناتەواوییان هەیە چون مەتەڵی برێك لە دیالێکت و زاراوە جۆراوجۆرەکانی‌تری کوردستانیان تێدا نییە.

هەر کەسێ بیەوێ لەم بوارەدا کار بکا و بەرهەمی بەپیز بڵاو بکاتەوە دەبێ کەڵك لە سەر کانی پێش خۆی بگرێ و هەوڵ بدا مەتەڵی نوێ بخاتە سەر کارەکە و لە ئەوانی تێپەڕ بکات وەگەرنە کارەکەی بێ سوود دەبێ. زۆربەی ئەو مەتەڵانە کە لە پاڵیاندا ناوی: ئەردەڵانی و ناوچەکانی‌تری کوردستان وەك: سەقز، مەریوان، هەورامان، کرماشان و لەکی و لوڕیم نووسیوە بۆ هەوەڵین جار کۆ کراونەتەوە. زۆرێك لەم مەتەڵانە تۆزی رۆژگاریان لێ نیشتبوو و بەداخەوە «کەس لای لێیان نەکردبووەوە» پێویست بوو کۆ بکرێنەوە و خاوێن ببنەوە و گەوهەری شاراوەیان تێدا دەربهێنرێ و بە پوختەکراوی بخرێنە بەردەست بەرەی نوێ.

هیوادارم ئەم لێکۆڵینەوەیەم شتێکی تازە بخاتە سەر خەرمانی مەتەڵی کوردی. ئارەزوومەندم شارەزا و رووناکبیران «کڵاوی خۆیان بکەنە قازی» و «بیدەنە بەر گەز و مقەست» و بە باشی سەرنج بدەنە بەرهەمەکە و کون و کەلەبەرە تاریکەکانی بە چرای زانست روون بکەنەوە و کەم و کورتیەکانم پیشان بدەن. قەد بەرهەمی بەپیز، بێ رەخنە و هەڵسەنگاندن چەکەرە ناکات و لق و پۆ ناهاوێژێ. منیش بە پێی توانای خۆم و بە تاکەسوار رووم کردووەتە ئەم مەیدانەوە هەوڵی تاکەکەسیی خۆمم داوە، ئەویش دەزانم «تەنیاباڵ، دێر ئەبێ بە ماڵ» ئەمجار کارەکەم کرد بە شەش بەشەوە:

**یەکەم)** بەشی زۆری مەتەڵەکان کە یەك وەڵامین لە ئەوەڵەوە هانیومە و گەر بۆ هەر بابەتێك چەن مەتەڵ گوتراوە بە پێچەوانەی سەرچاوەکانی‌تر هەموویانم لە ژێر یەکدا هانیوە. وا ئەزانم بە یەکەوە هاتنی دەقی مەتەڵەکان لە یەکدی نزیکیان دەکاتەوە و وا لە مرۆڤ دەکات کە بتوانێ بە ئاسانی بیر لە هەڵهێنانی بکاتەوە و ژمارەم بۆیان داناوە وەخت وا هەیە بۆ هەر مەتەڵێك ٢٠ دانە یان کەمتر هاتووە و ئاماژەم بۆ سەرچاوەکەی کردووە و لاپەڕەکەیشم نووسیوە و لە بەرانبەری مەتەڵەکاندا وەڵامەکەیانم هانیوە و ئەو مەتەڵانەی کە دەماودەمن ناوی دیالێکت و زاراوە و ناوچەکانم لە پاڵیاندا نووسیوە.

**دووهەم)** ئەم بەشەم تایبەت داوە بە ١٧١ موعەمما و مەتەڵی تایبەت بە بیر و هۆش (فکری) و بیرکاری

(ریاضي) و مەتەڵی جۆراوجۆری دیکە.

**سێهەم)** ئەم بەشەم تایبەت داوە بە مەتەڵی شاعیران و بۆ نموونە بڕێك لە مەتەڵەکانیانم هێناوە. هەروەها بڕێکی‌تر لە مەتەڵی شاعیران کە مەتەڵ نین بەڵام تایبەتمەندی و نیشانەی مەتەڵیان تێدایە.

**چوارەم)** ئەم بەشەم تایبەت داوە بە زوان خەڵەتێنەکان.

**پێنجەم)** ئەم بەشەم تایبەت داوە بە وەڵامی ١٧١ مەتەڵی بیری (فکری) و بیرکاری (ریاضي) کە زۆربەی ئەم موعەمما و مەتەڵانە بێ وەڵام بوون و خۆم شەرح و لێکدانەوەم لەسەریان کردووە.

**شەشەم)** ئەم بەشەم تایبەت داوە بە فەرهەنگۆك.

**ئیبراهیم ئەحمەدی - هاوینی ١٣٨٩ سنە**

## پێشەکی:

لەم بەشە لە مێژوودا کە فەرهەنگی خەڵکی و نەریتی کەوتووەتە بەر هێرشی فەرهەنگی بەدیهاتووی پێشکەوتن و پیشەسازی ماشینییەوە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بە پەلە دەستی پێکردووە و بەرەو شارستانیەتێکی نادیارمان دەبات، لێکۆڵینەوە بۆ ناسین و بایەخدان بە فەرهەنگی مرۆڤساز، لە کۆمەڵگای ئێمەدا گرینگایەتییێکی زۆری هەیە، هەتا بتوانین لە بەرانبەر هێرشی فەرهەنگی جیهانییەوە خۆڕاگر بین دەبێ (هەوڵ بدەین) فەرهەنگەکەمان دەوڵەمەندتر بکەین.

♠♠♠

**فولکلۆر (ئەدەبی زارەکی)**: بەرهەمی خەیاڵی و زەوقی هەمووی خەڵکە مولکی گشتییە کە دەماودەم و پشتاوپشت گوێزراوەتەوە، ئەم میراتە فەرهەنگییە - بیرییە پیشاندەری خەیاڵی بەهێز و هەستی خەڵکی کۆمەڵگاکانی ورد و گەورە لە سەردەمەکانی جۆراوجۆری ژیانی مرۆڤە. فولکلۆر تا رادەیەکی زۆر بە ژیانی خەڵك مانا دەبەخشێ و هیواداریان دەکا کە لە ژیانیاندا بەردەوام بن لە راستیدا ئەگەر فولکلۆری نەتەوەیەك لە ئەو بگرن، تەواو پێناسە و شوناسی ئەو نەتەوەیان لێ سەندووەتەوە کە بێ ئەو ژیان تەواو نییە. یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی فولکلۆر دووبارە بوونەوە و شیاوی گواستنەوە بۆ بەرەکانی داهاتووە

ئەدەبی فولکلۆری کوردی وەك ئەدەبی گەلانی‌تر لە هەر باسێکی فولکلۆریدا زۆر بەتوانایە و دەبێ شانازی پێوە بکەین. گەلی کورد خاوەنی کەلەپوورێکی زۆر دەوڵەمەندە و وەکوو گەنجینەیەکی بایەخدار لە باو و باپیرانیەوە پشتاوپشت بۆی ماوەتەوە و فولکلۆرێکی بەرچاو و لە بن نەهاتووی هەیە کە چەندین جۆر و لقی جیاجیای لێ دەبێتەوە و هەر لقێکی بۆن و بەرامەیەکی تایبەتی خۆی هەیە و باری ژیانی خەڵك بە شێوازێکی سادە دەرئەخات.

♠♠♠

**بەشەکانی فولکلۆر:**

١- بەشی زارەکی وەك: ئەفسانە، پەندی پێشینیان، قسەی نەستەق، گاڵتە و گەپ، ئاواز و گۆرانی، بەیت، هۆنراوە، چیرۆکی کورت و درێژ، داستان، نوکتە، لاسایی کردنەوە، تەتەڵەکردنی قسە، مەتەڵ سەرگوزەشتە و بەسەرهات، بەخت گرتنەوە، شین و لاواندنەوە، لایەلایە، پیاهەڵخوێندن و...

٢- ئەم بەشە پێی دەڵێن (ئەتنوگرافیا)[♠] شتی مادی و نازارەکین وەك: شایی و هەڵپەڕکێ، رەفتار و وتار، جل و بەرگ، داب و نەریت و خوو و رەوشت، نەخش و نیگار، جۆری خواردەمەنی نەریتی، چێشت لێنان و ئامێر و کەرەسەی کار، ئافرەت رازاندنەوە و ژن خواستن و بووك گواستنەوە، مردوو ناشتن، تەون کردن، جۆلایی، شاڵ و گۆرەوی و کڵاش چنین، جل و کاڵادوورین و لێف دوورین، هارەکردن و...

♠♠♠

**زمان و بەیان و ناوەرۆکی ئەدەبی زارەکی (فولکلۆر):** زمان و بەیانی ئەدەبی زارەکی ساکار و رەوانە و برێك لە قسە و ئەفسانەکان زمان و بەیانی رەمزیان تێدایە و لە نێوانیاندا گیانلەبەران و رووەکان رۆڵی مرۆڤ بەئەستۆ دەگرن و ئاخافتن دەکەن. زمان و دەربڕینی برێکی‌تر وەك ئەفسانە و چیرۆك پاشاکان گاڵتە و پێکەنین و راستین یان بە شێوەی فڕ و جەفەنگن.

زمان و وتەی گۆرانیە فولکلۆرییەکان زۆرتر بڕگەیی و ئاهەنگین و دەستوور و یاسای شیعری لە برێك لەوانەدا لەبەر چاو نەگیراون لە فولکلۆردا زۆرتر وشە و زاراوە باوەکان لە جۆری زمانی ئاخافتن خەڵکی کووچە و کۆڵانن.

---

♠ س.ف. بەرکوتێکی مەتەڵی... ل١٠

**بازرگان هات بە لەنگەلەنگ** **کوتاڵی هێنا لە هەموو رەنگ**

(بەهار و گوڵ)

**مەتەڵ** (puzzle): هەتەڵە، مەیل، هەڵێنە، چەوچە، مامك، تێدەرخستۆك، تشتانۆك، دەناچیە، لیچار، چمام، قاف، پەردەك، کورتە یا نووسراوەیەك کە مەبەست و واتای شاردراوەی تێدایە.*

بەم چەشنە مەتەڵانە عەرب دەڵێن: "لوغەز و موعەمما" و بە فارسی پێی دەڵێن "چیستان" کە کورتکراوەی زاراوەی (چیست آن؟) و بە لەکی پێی دەڵێن: (چێ کە چێ کە)

♠♠♠

**پێناسەی مەتەڵ:** مەتەڵ یەکێ لە جۆرەکانی فولکلۆر، نیشانەگەل و تایبەتمەندی شتێکە بێ ئەوەی ناوێك لە شتەکە ببەن لە بیسەر پرسیار دەکرێ و مەبەست لەم کارە لە راستیدا جۆرێك هەڵسەنگاندنی هۆشی بیسەر و کێبەرکێیە و زۆرتر بە وشەی «چییە» دەست پێ دەکا. بە واتایەکی‌تر مەتەڵ قسەیەکی پۆشراوەیە لە وەسف و هەڵسەنگاندنی شتێ لەگەڵ شتێکی‌تردا یان شتانی‌تری تەواو جیاواز. زۆرتر تایبەتمەندی و نیشانەگەلێك لە شتێك بە خواستن (ئیستعارە) و کینایە (درکە) بۆ تاقی کردنەوەی هۆشی بیسەر دەرئەبڕن و ناوی ئەو شتەیان دەوێ.

مامۆستا عەلائەددین سەجادی دەڵێ: مەتەڵ بە مەعنای شتێکی گرێ کوێرەیە و بە زەحمەت و بیرکردنەوەیەکی زیاد ناوەڕۆکەکەی ئەزانرێ بریتییە لە چەند وشە و رستەیەکی کەم یەکێك داینـاوە بۆ زاخاوی مێشك واتە بیری لە شتێك کردووەتەوە، ئەو شتەی خستووەتە قالبی چەند وشەیەکەوە ئەیپرسێتەوە لە کەسانی‌تر بۆ ئەوەی ئەوان بیری خۆیان بخەنە کار بۆ هەڵهێنانی. (دەقەکانی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سەجادی ل ١٦٣)

♠♠♠

**لێکدانەوەی مەتەڵ:** لێکدانەوە لەسەر مەتەڵ زۆر شتی نادیار و شاراوەمان بۆ دەرئەخات، بیرتیژی، هۆشیاری، ژیری، وردبینی، وریایی و رەسەنی نەتەوەی ئێمە دەرئەخات و زۆر زاراوە و وشەی تایبەتیمان بۆ ئەپارێزێ و لە تیاچوون رزگاریان ئەکات. فرە دیالێکتی و زاراوەی جۆراوجۆر وەهای کردووە کە هەر

---

* مردوخ روحانی، محمدماجد (١٣٨٥)، فرهنگ فارسی – کوردی، دانشگاه کردستان، ل ٨٦٨

ناوچەیەك مەتەڵی تایبەت بە خۆی هەیە و ئەمە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی مەتەڵەکان، فۆرم و شێوەی دەربڕینیان ئەگۆڕێ بەڵام ناوەرۆکیان ناگۆڕێ. لێرەدا چەن مەتەڵێك لە دیالێکت و شێوازە جۆراوجۆرەکان دەخەینە بەرچاو.

**١- کرمانجی باکوور:**

**ئەلف/** «دەسرۆکەکا گول گولی، تژی سێڤێت سۆر کری» (ئاسمان و ئەستێرە)

**ب/** «چار برایە، جا دیارە، یەکی گەرمە، یەکی سارە، یەکی بارە» (هاڤین، زڤستان، بەهار، پاییز)

**٢- کرمانجی نیوەڕاست (سۆرانی):**

«حەوزە قووڵە، دەوری تووڵە» (چاو)

**٣- کەلهوڕی:**

«ئەگەر فام دیری فامد لە هۆرە/ کام لەی مەلەیلە وەهار وەشیرە» (شەمشەمەکوێرە)

**٤- گۆران:**

«نانوو شەویٚ رۆنە بریو، پانزە رویٚ جا وریۆ» (مانگ)

♠♠♠

زۆرێك لە مەتەڵەکان زەینی بێ وێنەی خەڵك دروستیانی کردووە لە سەرەتادا زۆر سەرسووڕهێنەر و دوور لە زەینن. جار وا هەیە وشەیەك بۆ سەر لێ شێوانە و مرۆڤ بە هەڵەدا دەبات و لە وەڵامی دروستی مەتەڵەکە دووری ئەخاتەوە. وەك: «ملی هەیە و سەری نییە، باسکی هەیە و دەستی نییە.» (کراس) و جاری وا هەیە برێ لە وشەکان بۆ ئاهەنگین کردن و رازاندنەوەی مەتەڵەکە دێن و هیچ مانایەکیان نییە. وەك: «هەلاران و مەلاران هێلکە دەکەن لە داران بۆ فەقیر و هەژاران». دوو وشەی هەلاران و مەلاران بۆ رازاندنەوەی مەتەڵەکە هاتوون و مانایەکیان نییە. زۆر دەقی ئەم مەتەڵانە هەڵدەگەڕێنەوە بۆ بەر لە ئیسلام و لەگەڵ پەندی پێشینیاندا کۆنترین دەقی پەخشانی ئەدەبیاتی کوردین. وەك:

«رەقە بە رەق دەکەویٚ سوورە بە نەرمی دەکەویٚ». (ئەستیٚ و بەرد و ئاگر و پووش) (س.ئـ.٣٩٥)

«چوومە سەر بەردیٚ روانیم لە زەردیٚ داریٚ بە چەپۆك بەربووە لە بەردیٚ». (ئاشی ئاو)

«زەوین لافاوە، شارێك لەسەر ئاوە، هەموو زیندەوەرێکی لە ناوە». (لافاوی سەردەمی نووح و گەمیەکەی)

♠♠♠

زۆرێکی‌تری مەتەڵەکان هەڵئەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ئیسلامی چون بابەتی ئیسلامیان تێدایە وەك: «پیاوێ نوێژی ئەکرد، سلاّم لای راسی داوە نوێژەکەی بەتاڵەوە بوو، سلاّم لای چەپی داوە تەلاّقی کەفتە سەری هەڵبڕی رۆژووەکەی شکیا». بڕێکیان بابەتی ئەمڕۆییان تێدایە وەك: تلویزیۆن، رادیۆ، ماشین جلشۆر، ئاومێوەگیری و... بۆ نموونە: «ئەوە چییە بەرزی ئەکەیتەو یەك پای هەیە، دایئەنی سێ پای هەیە». (چەرخ، فرغۆن)

♠♠♠

**جۆرەکانی مەتەڵ:** مەتەڵ بە دوو جۆر هاتوون. نووسراو، نەنووسراو (زارەکی)

مەتەڵی نووسراو: بەرهەمی شاعیر و ئەدیب و خەڵکی خوێندەوارن. وەك: «دوو مەشعەل لە نێو یەك سەرای بێ دەر/ چوار پەلۆش هەن شەش لاشە و یەك سەر» - «پەنج فریشتە ئاهووی یەك رەنگ/ بردنە بان سارای سفی رەنگ/ ئاهوو دوو شاخی هاوە سەرەوە/ بان شاخەکانی بە گەوهەرەوە»

دووهەم مەتەڵی نەنووسراو: بەشێکی زۆر لە ئەدەبی زارەکی یان فولکلۆرە، کە بەرهەمی بیرتیژی و هەستی ناسکی مرۆڤن. ئەم مەتەڵانە وێژەرێکی ناسراویان نییە و زۆرتر پیشاندەری جۆرێك بۆچوونی سەرجەمی خەڵکن لە دیاردەکانی سروشت و ژینگە و بەر و بوومی ناوچەیی.

مەتەڵی خەڵك بە دوو شێوەی شیعر و پەخشانن، پێکهاتەیەکی ساکار و زمان و بەیانێکی سادە و ساکاریان هەیە و بە شێوەی خواستن (ئیستعارە) و لێکچواندن (تشبیە)ن و خەڵك لێیان تێ دەگەین و لەسەر زمانی چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی شاری و لادێ دەگەڕێن. وەك: «کولەوەژی گیانکێشانی، دۆست و دوژمن نازانی» (تفەنگ) - «خڕ وەك هەرمێ، سپییە وەك بێ؟» (پەمۆ)

بڕێك لە مەتەڵەکان گاڵتە و گەپ و پێکەنینیان تێدایە و هەندێکی‌تریان جنێو، قسەی تاڵ و ترش و جاری واش هەیە قسەی شیرین و شتگەلی‌تریان بە شێوەیەکی پۆشراوە... تێدایە. وەك: «دەمی تاقە، چاوی زاقە» (کلاّو) - «سەری یەکە و بنی دوو بە باوك و باپیرتا چووە» (شواڵ دەرپێ) - «بنی دەگلی، قەدی دەکەرێ سەر دەتوو، ئەگەر نەزانی چاوت دەرێ» (کەنگەر) - «وردیلە، وردیلە، لە بن بەردیلە، هەرکەس نەیزانێ ناوی ئەنێم بێچووە پشیلە؟» (دۆڵمە)

♠♠♠

**کەڵك و سوودی مەتەڵ:**

١- بۆ هەڵسەنگاندنی هۆش و روایی و کێبەرکێ و کات بەسەربردن و زاخاوی مێشك.

٢- هەڵهێنانی موعەمما و مەتەڵ دەبێتە هۆی بەهێزبوونی بیر و هۆش هەتا مرۆڤ هۆشیارتر ئاوڕ لە کێشە جۆراوجۆرەکان بداتەوە و رێگا چارەی باشیان بۆ بدۆزێتەوە و لە راستییەکان بگات.

٣- کەسانی ژیر و هۆشیار جیا دەکاتەوە، کەسانێ لە هەڵهێنانی مەتەڵدا ئازا بن داهاتوویەکی پرشنگدارتریان دەبێ.

٤- وشە و زاراوەکان ئەپارێزن و دەتوانین ئەو شانە بۆ مانا و مەبەستێکیتر بەکاو بێنین و زمانەکەمانی پێ دەوڵەمەند بکەین.

٥- بۆ ئەوەی قوتابیان سوودی لێ وەرگرن و بیر و هۆشیان گەشە بستێنێ و داهاتوویەکی روون بەرچاویان ببێت، دەبێ لە قۆناخی سەرتایید لە وانەکانا بیخوێندرێ.

٦- شیکردنەوە و لێکدانەوەی مەتەڵەکان و زاراوەکان لە چەندین روانگەی کۆمەڵناسی، ئابووری، مێژوویی و کەلتووری و... زانیاری پێویست سەبارەت بە رابردوومان ئەدەن بە دەستەوە کە مرۆڤ بۆ بەردەوامبوونی لە ژیاندا چی کردووە و چ گیانلەبەرێکی بەخێو کردووە و چی چاندووە بۆ پێخۆری ژیانی و چ ئامێر و کەرەسەیەکی بەکار هانیوە و ئەو هەژار و رەش و رووتانە کە خاوەن مڵك و ماڵێك نەبوون چلۆن ژیاون و پێداویستییەکانی ژیانی خۆیان و کەسانیتریان چۆن دابین کردووە...؟

٧- زۆرێك لە موعەمماکان مەبەستدارن و فێر ئاکار و خوو و رەوشتی جوانمان دەکەن و زەینمان هۆگر دەبێ بچێ بە شوێن دۆزینەوەی رازی نێو موعەمماکان و چۆنیەتی رووداوەکاندا.

♠♠♠

**پێکهاتەی مەتەڵ:** مەتەڵ رستەیەك یان دەستەواژەیەکە وەسفکراو کە ماکەی وەسفکراو بەشی بنەڕەتی پێکهاتەکە پێك دێنێ و توخمی وەسفکراو داگری بابەتێك و شیکردنەوە یان لێکدانەوەیەکە.*

لە هەر مەتەڵێکدا لانی کەم بابەتێك یان شتێك هەیە کە ئاشکرا وەسف دەکرێ (بابەت) و هەواڵێك سەبارەت بەو بابەتە یان شتە ئەدرێ (شیکردنەوە یان لێکدانەوە) وەکوو:

١- «تاقێکە سی و دوو بەردی تێدایە.» (دەم و ددان)

٢- «دارەکەی سەر تەجەرە هەر پەلێکی سەد خنجەرە.» (خۆر)

* موحەممەدعەلی ئیمامی ئەهوازی، چیستاننامەی دزفوولی ل ٢٥

٣- «شتێك هەیە چوار منداڵی لە سكیدایە.» (گوێز) لەم مەتەڵانەدا «تاق» و «دارەكەی سەر تەجەر» و «شت» لە رستەكانی ١ و ٢ و ٣دا «بابەت» و «سی و دوو بەردی تێدایە» و «هەر پەلێكی سەد خنجەرە» و «چوار منداڵی لە سكیدایە» لە رستەكانی ١ و ٢ و ٣دا هەواڵ و لێكدانەوەكەیانن.

لە بڕێك لە مەتەڵەكاندا دوو یان چەن شتی راڤەكراو هەیە. وەكوو: «بە بەرخی سپییە، بە شەكی سوورە، بە مەڕی رەشە.» (ترێ) كە ئەم سێ (ماكە) پێكەوە جۆر و هاوئاهەنگن. لە بڕێكی‌تر لە مەتەڵەكاندا (تۆخمەكان) پێكەوە جۆرن، یان ناجۆرن وەك: ناڤكی دارینە، سەركی زەڕینە. (مێو).

«تاڵە شیرین نییە، پڕچنگە هەنار نییە، حەز ئەكا قازی نییە، حوكم ئەكا حاكم نییە.» (دڵە)

هەشت (ماكەی) راڤەكراوە كە (تۆخمەكان) دوو بە دوو پێكەوە دژ یەك و ناتەبان و تۆخمەكانی وەسف‌كراو «شیرین نییە» و «هەناری نییە» و «قازی نییە» و «حاكم نییە» لەگەڵ تۆخمەكانی «تاڵ» و «پڕچنگ» و «حەز ئەكا» و «حوكم ئەكا» دژ بە یەك و ناسازن و تاڵ بوون و پڕچنگ بوون و حەز كردن و حوكم كردن رەد دەكەنەوە.

«تولان داوی مێو نییە، پێوە دەدا مار نییە، هەرمێ دەگرێ دار نییە.» (تەل و داری كارەبا-دار بەرق)

لەگەڵ روونكردنەوەی پێكهاتەی مەتەڵ و هێنانی چەن نموونە ئێستا دەتوانین پێناسەیەك لە پێكهاتەی مەتەڵ بكەین.

مەتەڵ: مەتەڵ جۆرێك دەربڕینی زمانییە هاوڕێ لەگەڵ یەك یان چەند (ماكەی) راڤەكراوە كە وەڵامی دروستی راڤەكراوەكانی دەوێ.

مەتەڵەكان دەبنە دوو بەشەوە كە بەشێكیان «دژ بە یەكن» و بەشێكیان «دژ بە یەك نین» كە هەركام لەمانە چەن لقی‌تریان لێ جیا دەبێتەوە.

**مەتەڵەكان:**

**١- دژ بە یەك نەبوون:**

١. خواستن (ئیستعارە) وەك: «خانووی یەك كۆڵەكە» (قارچك)

٢. راستی وەك: «ناوی سپییە، پێستی سەوزە» (خەیار)

**٢- دژ بە یەك بوون:**

١. وەکوو: «دەڕوا لاقی نییە، دەگری چاوی نییە، هاوار دەکات زاری نییە.»

٢. «ئەوە چییە را دەکا هەنگاو نانێ، دەمی هەیە قسە ناکا، سەری هەیە و ناگری، جێگای خەوی هەیە و ناخەوێ.»

٣. «لە هەموو شت ڕەقترە و لە هەموو شت نەرمترە.»

مەتەڵی جۆر و تەبا بە پێی ناوەرۆك دەبنە دوو بەشەوە: **یەکەم:** خواستن (ئیستعاری) و **دووهەم:** ڕاستی

یەکەم: خواستنی وەك: «خانووی یەك کۆڵەکە» (قارچك). «سەری دەبڕی بەفرِ دێ» (گەڵا). ئەمانە مەتەڵانێکن کە پێکهاتەی ڕاڤەیی خواستنییان هەیە.

دووهەم: «سەری سەوزە، بنی سوورە» (گەزەر). «ناوی سپییە، پێستی سەوزە» (خەیار). ئەمانە مەتەڵانێکن کە لە ماکەی ڕاڤەکراوی ڕاستی پێك هاتوون.

١- لە برێ لە مەتەڵەکاندا دوو ماکەی ڕاڤەکراو لەگەڵ یەکدا دژ و تێکدەری یەکن. وەکوو: لە هەموو شت ڕەقترە و لە هەموو شت نەرمترە (زمان). دوو توخمی شەرحکراو هاتوون کە بە یەکەوە ناجۆرن و تێکدەری یەکن لەم مەتەڵەدا توخمی ڕاڤەکراوی «لە هەموو شت ڕەقترە» و «لە هەموو شت نەرمترە» دژ بە یەکن و شتێك ناتوانێ لە هەمان کاتدا هەم «ڕەق» بێت و هەم «نەرم» بێت.

٢- لە برێ لە مەتەڵەکاندا مەتەڵانی دژ بە یەك پێك دێنن. بەم جۆرە کە یەکێ لە توخمی ڕاڤەکراوەکان تایبەتمەندی و کۆڵەکەی بنەڕەتی شتی ڕاڤەکراوی پێشوو ڕەد دەکاتەوە و ئەو شتە لە هەبوونی ئەو چۆنایەتییە و کۆڵەکە بنەڕەتییەکەی بێبەش دەکا. وەکوو: «پای هەیە و ناڕوات.» (قورسی)

ماکەی ڕاڤەکراوی دووهەم کاردای پێ لە (ڕێگەچوونە) و لە توخمی وەسفکراوی ئەوەڵدا هاتووە ڕەد دەکاتەوە و ئەو لەم تایبەتمەندی و کاردا بێبەش دەکا.

یان لە ئەم مەتەڵەدا «ئەوە چییە را دەکا، هەنگاو نانێ دەمی هەیە قسە ناکا، سەری هەیە و ناگری، جێگای خەوی هەیە و ناخەوێ» (هەور) کە لە چوار بەش پێکهاتووە. توخمی شەرحکراوی و هەر بەشێ لە دوو توخمی ڕاڤەکراوی ناتەبا پێك هاتووە. لە هەر کام لە ئەم چوار بەشەدا ماکەی وەسفکراوی دووهەم دژ بە توخمی ڕاڤەکراوی یەکەمە و تایبەتمەندی و چۆنایەتی ئەو ڕەد دەکاتەوە. ئەزانین کە هەر شتێك را بکا و دەم و سەر و جێگای خەوی ببێت دەبێ هەنگاو و قسە کردن و گریان و خەوی هەم ببێ، بەڵام دووهەمین توخمی وەسفکراوی هەر بەشێك چاوەڕوانی هەنگاو و قسە کردن و گریان و خەو لە تایبەتمەندی ڕاکردن و

دەم و سەر و جێگا خەو دەسێنێتەوە و بێوەری دەکا.

٣- بڕێتر مەتەڵانێکن کە ماکەی راڤەکراو و دژ بە یەك لەواندا پێکەوە ناتەبایی لۆژیکیان هەیە. بەم جۆرەیە کە ماکەی شەرحکراو پەیڕەوی لە نیشانەی گونجاو و چاوەڕوانکراو لە کرداری تایبەت بە توخمی وەسفکراویتر ناکات و لەگەڵیدا ناتەبا بێت. وەکوو: «دەڕوالاقی نییە، دەگری چاوی نییە، هاوار دەکات زاری نییە» (هەور). بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانکراو، ئەو بوونەوەرە وەسفکراوە، بێ پێ هەم دەڕوات بە رێگادا و هەم بێ چاو ئەگری و هەم بێ دەم هاوار دەکات.

♠♠♠

**موعەمما:**

١- لەغەز، لیچار، مەتەڵ چماچ قاف، پەردەك مەتەڵۆکە، تشتانۆك چمامك: بابەت یان گەڵاڵەیەکە وەك پرسیارێك دەگوترێ و بەرپرس دەبێ ناوی شتێ، کەسێ یان بابەتێکی تێدا بدۆزێتەوە، بۆ هەڵسەنگاندنی هۆش و وریایی.

٢- دۆخ یان رووداوێك کە تێگەیشتنی دژوارە.[♠]

♠♠♠

**پێناسەی موعەمما:** ناوی کەسێ یان شتێ لە دڵدا بشارنەوە و چەندین وەسف هاوڕێ لەگەڵ رەمز و ئیشارە بۆ بیننەوە. کە تێکەگەیشتن لە وەڵامەکە نیازی بە رامان و تێفکری هەیە. لە موعەممادا زۆرتر بە پیت و وشەکان کایە دەکرێ وەکوو:

شاری دڵنشین خۆش ئاو و هـــەوا     شەسی لێ بە لا خۆی ئەبێتە لا

مەبەست «سنە»یە.

یەك پێنج حەرفییە دوانی تێکراره     حەرفی ئەوەڵی شێوەی هـــەزارە
حەرفی دووهەمی قەلبی دڵـــدارە     حەرفی سێهەمی وەك برۆی یارە
نە فرە زۆرە نــــــە فرە خوارە     عومر زیادتر لە سی هـــەزارە

(ئەردەڵانی)

دڵ نامەرد قەلب قابل دەرمـــان و دەرمانە     دڵ نادان دەوای نییە کە نادان قەلبی نادانە

(مەحموود ئەحمەدی)

---

♠ مردوخ روحانی، محمدماجد (١٣٨٥)، فرهنگ فارسی – کوردی، دانشگاه کردستان، ل ٢٢٠٦

وتم نێوت چییە کیژە کـــوردی لادێ　　لە ڕووی لێوت بە دەگمەن پێکەنین دێ

وتی شەوگـــارۆنم فرمێســـــکەکانم　　لە من نابڕن هەتا کۆتـــایی ژین دێ

(موحەممەدی جوانڕۆ)

♠♠♠

**جیاوازی مەتەڵ و موعەمما:** بە بیر و بڕوای زانایان مەتەڵ و موعەمما (لیچار، لۆتەر) لە بنەڕەتدا یەك جۆرن جگە لەمە مەتەڵ بە شێوەی پرسیار دێتە ئاراوە. زانایان دەڵێن مەتەڵ لە سەرەتادا تا رادەیەك سادە و ساکار بووە و مرۆڤ باشتر لێی تێگەیشتووە، بەڵام کە دژوارتر و پێچراوەتر بووە بە شکڵی موعەمما دەرهاتووە و پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆرتر بووە. مەتەڵ و موعەمما شان بە شانی یەك پێك هاتوون و هەروەکوو یەك باویان بووە. لە موعەممادا بناغەی کار زۆرتر ئەوەیە کە بە پیت و وشەکان کایە دەکرێ.

## پۆلێن کردنی مەتەڵ بە پێی بابەت و ناوەرۆک

**ئەلف: مەتەڵی تایبەت بە ئایین:**

✓ یەکە و نابێتە دوو، دووە و نابێتە سێ، سێیە و نابێتە چوار، چوارە و نابێتە پێنج، پێنجە و نابێتە شەش، شەشە و نابێتە حەفت، حەفتە و نابێتە هەشت، هەشتە و نابێتە نۆ، نۆیە و نابێتە دە، دەیە و نابێتە یانزە، یانزەیە و نابێتە دوانزە، دوانزەیە و نابێتە سێنزە. (س.ئـ.١٠٢)

✓ هەنیکم کردگە بە دوانزە قاشەوە یانزە قاشی حەڵاڵە و قاشێکی حەرامە. (ئەردەڵانی) (١٢ مانگ و یەک مانگ رەمەزان)

✓ شەرعییە وەلێ خوا خۆشی لێ نایەت. (ن.سەقز) (تەڵاق)

ئەم بابەتە ئایینیانە بوون بە مەتەڵ وەک: خوا، ئادەم، رۆژوو، قورئان، نوێژ، مارەیی و... بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**ب: مەتەڵی تایبەت بە سروشت و دەوروبەری ژیانی مرۆڤ:**

✓ماڵێکمان هەیە سپی پڕ لە خاڵ، دوانزە پای هەیە و سیسەد و شەست و پەنج باڵ. (ن.سەقز) (ساڵ)

✓ ئەگەر عەقڵت هەس و عەقڵت هاپێوە!/ پیرۆزەس و سێ شتی هاپێوە. (ئەردەڵانی) (ئاسمان، ئەستێرە، مانگ)

✓ دارەکەی سەر تەجەرە، هەر پەڵێکی سەد خنجەرە. (ئەردەڵانی) (خۆر)

✓ ئەوە چییە هەر بگری ئەمرێ. (هەور)

ئەم بابەتانە بوون بە مەتەڵ. وەك: خۆر، سێبەر، رۆژ، ئاو، با، تەرزە، بەفر، ئاگر، هەورەتریشقە و... بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**ج: مەتەڵی تایبەت بە مرۆڤ و ئەندامەکانی لەش:**

✓ ئەوە چ گیانلەبەرێکە بەیانی بە چوار پا و نیمەڕۆ بە دوو پا و دوانیوەڕۆ بە سێ پا ئەڕوات. (ئەردەڵانی) (مرۆڤ)

✓ دوو ماری رەش، دوو چرای گەش، دوو کونە رێوی. (ئەردەڵانی) (دەم و چاو)

✓ مۆترە ئاوێکە بێ بەرق و بەنزین/ نە کار ژاپون نە مۆنتاژی چین/ سەد ساڵ کار ئەکا بێ وەقفە و تەفسیر/ بە بێ گازۆئیل رۆغەن و تەعمیر. (ئەردەڵانی) (دڵ)

✓ بانێکە و هێوانێکە، چوار بزن و شوانێکە. (ئەردەڵانی) (پەنجەی دەس)

ئەم بابەتانە بوون بە مەتەڵ: وەك: دەس، ریش، زمان، سەر، چاو، لێو، لووت، مەمك، منداڵ، کچ، خەو و ناو، زانست و... بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**چ: مەتەڵی تایبەت بە جل و بەرگ و کەلوپەلی تایبەت بە مرۆڤ:**

✓ چەس قسە ئەکا، زوانی نییە، مووچیاری ئەکا و بەیانی نییە. (ئەردەڵانی) (کتێب)

✓ بە شەوا قسرە و بە رۆژا ئاوسە. (ئەردەڵانی) (کەوش)

✓ پشتی هەس و بەری نییە، گوێچکەی هەس و سەری نییە. (ئەردەڵانی) (فەرەنجی)

✓ ژێرەکەی پەڕۆ و بانەکەی چەرمۆ، بیکەوە خۆتا خۆشحاڵ بڕۆ. (ئەردەڵانی) (کڵاش)

✓ میمکە مەتێ لە کونا دەرتێ، سی و سێ نەفەر دەرەقەتی نەتێ. (ئەردەڵانی) (تفەنگ)

ئەم بابەتانە بوون بە مەتەڵ. وەك: کڵاو، کراس، شانە، ئاوێنە، سەعات، قەڵەم، پووڵ، کەوچك و...

بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**ح: ئامێر و کەرستەی کارکردن و کەلوپەلی دیکە:**

✓ یەك چاو و تەیارم، جێ باوەڕی دەولەمەند و هەژارم. (ئەردەلانی) (کیلۆ)

✓ گولە گالە پڕ ناو مالە. (ن.سەقز) (لامپا) (لامپ)

✓ بە شەوا خانمە و بە ڕۆژا کارکەرە. (ئەردەلانی) (گزگ)

✓ هەلدم هەلدم، شەش پا و دوو سم. (ئەردەلانی) (مەریوان) (مەشکە)

✓ چەس تا ئەنگۆست نەکەیتە چاوی دەم ناکاتەوە دروست و حەساوی. (دوێرد - قەیچی - مقەست)

✓ بیگری مشتێکە بەری بەی پڕ دەشتێکە. (ئەردەلانی) (نەفس - چاو)

✓ دار لە بان دار ئاسن جلۆدار. (تەشی)

ئەم بابەتانە بوون بە مەتەڵ وەك: درگا، چادر، گسك، چرا، مشار، دەرزی، زوخاڵ، سەماوەر، جووت و جووتیار، تەرازوو و ڕەشکە، ئاشی ئاو، بانگردێن، دەهۆڵ، بەلەم، ئاوێنە، فەرش، ڕێگە، مەڕدۆشین و...

بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**خ: مەتەڵی تایبەت بە ڕووەك (گیا) و بەروبووم و خواردەمەنی ڕووەکی:**

✓ چل تاق چل نیم تاق، چل حوجرە و چل بەیاخ. (هەنار)

✓ زەوینەکەی سەوزە، شارەکەی سوورە، مەردمەکەی ڕەشە. (هەنی - شووتی)

✓ عالەم خواردوویە، ئادەم نەیخواردووە. (ن.سەقز) (شیر)

✓ بەری هەسانە، پشتی قورئانە. (قارچك)

✓ سەوزە وەك خەیار، بەرزە وەك چنار، ترشە وەك هەنار. (ڕێواس)

✓ بەری پەراسوو، پشتی کولێرە، گەر هەلیبێنی دەنگت دلێرە. (ئـ. ٣٥) (مێو)

ئەم بابەتانە بوون بە مەتەڵ وەك: نۆك و برنج، ئارد و نان، باینجان، تەرەپیاز، هەنجیر، قەیسی، خورما، پیشۆك، نیسك و... بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**ر: مەتەڵی تایبەت بە زیندەوەر و ئاژەڵ و بەر و بوومی ئاژەڵی:**

✓ ئەشکەوتی سەد پاڵەوانان، بە قامکە پووشێ دەگیرێ؟ (شارەمێروولە)

✓ نە مەمکی هەیە نە گوان، شیر دەدا بە هەمزە پاڵەوان. (هەنگ)

✓ ئەمە چەس ها ناو ئاوا و لە تینگیا ناو سکی رەشەو بووگە. (ماسی)

✓ درێژە وەك شریتە، نەرمە وەك هەویر. (مار)

✓ لە دوور مەیۆ، لە دوور مەیۆ، گرمەی بەرانەسوور مەیۆ؟ (زەردەواڵە)

ئەم بابەتانەی خوارەوە بوون بە مەتەڵ وەك: قرژانگ، قورواق، کیسەڵ، هێلکە، پەڕەسیلکە، کەو، کەڵەشێر، مشك، سەگ، گیپە و... بڕوانە بۆ دەقی مەتەڵەکان.

♠♠♠

**ز: ئەم بەشە لە مەتەڵم تایبەت داوە بە مەتەڵی بیرکاری (ریاضي) و بیر و هۆشی (فکری) و مەتەڵی جۆراوجۆری دیکە:**

**لێرەدا بۆ هەرکام لەم مەتەڵانە نموونەیەکی کورت دێنمەوە بەڵام بە گشتی بڕوانە بۆ بەشی ١٧١ مەتەڵ و موعەمما.**

**ئەلف: بیرکاری**

| ١٥ | ٢٢ | ٩ | ١٦ | ٣ | ٦٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢ | ١٤ | ٢١ | ٨ | ٢٠ | ٦٥ |
| ١٩ | ١ | ١٣ | ٢٥ | ٧ | ٦٥ |
| ٦ | ١٨ | ٥ | ١٢ | ٢٤ | ٦٥ |
| ٢٣ | ١٠ | ١٧ | ٤ | ١١ | ٦٥ |
| ٦٥ | ٦٥ | ٦٥ | ٦٥ | ٦٥ | ٦٥ |

**یەحیا لوتفوڵلانەسەب**

بیست و پێنج (ژمارە)، لە یەکەوە تا ٢٥ بە بێ دووبارەکردنەوە، لە ناو ٢٥ چوار گۆشە (٥×٥)دا بنووسە بە مەرجێك سەرجەمی کۆی پێنج گۆشەکانی لە تەك یەك بە ستوونی بکاتە ٦٥ و بە ئاسۆییش هەر بکاتە ٦٥ و بە شێوەی (×) هەر بکاتە ٦٥.

| ١٥ | ٢ | ٧ | ٦ |
|---|---|---|---|
| ١٥ | ٩ | ٥ | ١ |
| ١٥ | ٤ | ٣ | ٨ |
| ١٥ | ١٥ | ١٥ | ١٥ |

**یەحیا لوتفوڵلانەسەب**

لە یەکەوە تا نۆ بە بێ دووبارەکردنەوە لە ناو نۆ چوار گۆشەی (٣×٣)دا بنووسە بە مەرجێك سەرجەمی کۆی چوارگۆشەکانی لە تەك یەك بە ستوونی بکاتە ١٥ و بە ئاسۆییش هەر بکاتە ١٥ و بە شێوەی (×) هەر بکاتە ١٥.

♠♠♠

**ب: بیر و هۆش**

✓ ناو بەحریلەی کە گومناو و هەژار/ سەری داپۆشی ئەوێتە رێبوار (زرێوار)

✓ مووچەخۆرێك لەگەڵ ژنەکەی بەرپرسی لەگەڵ خوشکەکەی سێ سێو دەکڕن هەر یەکە دانەیەکیان بەرئەکەوێ بڵێ چۆن؟

✓ دە لە دەیان دەربێنی دەمێنێتەوە دە. (س.ئـ.٢٣١) (دەستەوانە، دەسکێش و پەنجەکانی هەر دوو دەست)

✓ دە و دە ناکاتە بیست لەگەڵ پەنجای دەکاتە پانزە. (١٠١٠) (س.ئـ. ٢٣٥)

♠♠♠

**پ: مەتەڵی تایبەت بە بابەتی جۆراوجۆر:**

✓ لە نێوان ئاسمان و زەویدا چی هەیە. (و)

✓ ناوی خواردنێکە لە هەر لاوە بیخۆی وەك یەکە. (نان)

✓ لە پەنجەرە دەچێتە ژوورەوە و لە درگا دێتە دەرەوە. (نامە و سندووقی پۆستە)

♠♠♠

**ت: ئەو مەتەڵانەی کە وەڵامیان لە خۆیانە:**

✓ دارێکمان هەس بانەکەی کانییە.

✓ بی تەڕە، تاڵە.

✓ کاچوو مادانی.

✓ خوانەی ناوەو هەس.

✓ خوشکەکەتان ژنی کامتانە؟

✓ سی پەنج پانزە و دوو حەڤدە و سێ بیست. ٢٠=٣+١٧=٢+١٥=٥×٣

✓ مۆز تەڕە لینجە.

## ڕەوانبێژی و جوانکاری لە مەتەڵدا

لە موعەمما و مەتەڵدا جۆرەکانی هونەری ڕەوانبێژی و جوانکاری وەك: خواستن (استعارە) و خوازە (مجاز)، لێکچواندن (تشبیە)، کینایە (درکە) دژ بە یەك، ڕەگەزدۆزی، چاولەیەك، تێهەڵکێش، تیل‌نیشان، کورتبڕی و درێژبڕی، توانج‌پۆشی بەرچاو ئەکەون و زۆربەی زۆری مەتەڵەکان کێش و سەروادار و بڕگەیین، یان بە شێوەی پەخشانێکی ئاوازدارن. لە لێکدانەوە و شەرح کردنی هەندێك مەتەڵا بە کورتی ئاماژە بە چەند نموونەیەکە دەکەین.

مەتەڵ و پەندی پێشینیان و قسەی نەستەق و تا ڕادەیەکیش ئیدیۆم (درکە)، ئەگەرچی لە بابەتە فولکلۆریەکاندا سەربەخۆ و جیاوازن بەڵام لە زۆر دەقی فولکلۆردا ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ سوود لە ناوەرۆك و ڕوخساری یەکتر وەردەگرن. وەك: ناخۆری پێنج نەنگوست چییە؟ لە مەتەڵدا ئەگەر، چییە لابەین کینایە (ئیدیۆم) دەردەکەوێت. ناخۆری پێنج نەنگۆست. کینایەیە لە مرۆڤ.

«شەو لە بان» وەك کینایە بەکار هاتووە و لە مەتەڵدا داوای وەڵام دەکات «شەو لە بان چییە؟» بانگلێر (مەتەڵ) یان «وەك نیسك بەر و پشتی بۆ نییە» کینایەیە و لە مەتەڵدا ناوی نیسك لابراوە وەك: «ئەوە چییە وەك پیاوی سپڵە نە بەری هەیە نە پشت» و پرسیار لە ناوەکە دەکات و لە کینایە و قسەی

نەستەقدا ناوی نیسك هاتووە و مەبەستی پیاوی سپڵە و بێ بار و بێ بەر و پشتە.*

یان لە ئەم پەندەدا «دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقلیشێ» لە مەتەڵدا ناوی دار لابراوە وەك: «ئەوە چییە تا لە خۆی نەبێ ناقلیشێ» پرسیار لە ناوەکە دەکات.

ئەگەر لە مەتەڵانی خوارەودا چییە لابەین دەبنە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەق و کینایە (درکە).

«چییە لە ناو چاواندا لووت دەردێنێ، با بە لای مارا کلکی ئەقرتێنێ؟» (دز)

ئەگەر چییە لابەین دەبێتە دوو پەند کە مەبەستی کەسێکی زۆر زیرەکە.

«چییە بۆ شەوێکیش بێ، جێگەی خۆی خۆش ئەکات؟» (بزن)

بە شێوەی پەندی پێشینیان (بزن بۆ شەوێك جێگەی خۆی خۆش ئەکات) مەبەست مرۆڤی ئیشکەر و چالاکە.

«چییە لە ماڵ خۆیدا دەنگ ناکات؟» (ورچ)

«ورچ لە ماڵ خۆی دەنگ ناکات.» (پەند)

«چییە دۆستی خۆتە و دوژمنی خۆتە؟» (زمان) مەتەڵ بە شێوەی پەند «دۆستی خۆتە و دوژمنی خۆتە و هەر لە خۆتە» (زمان).

«تانجییە رەشی دەم هەراش، خێو و خاوەنی ناناسێ» ئەگەر بە کەسێك بڵێین تانجییە رەشی دەم هەراش کینایە لە کەسێ کە فرەوێژ و زۆربڵێیە.

رەوانبێژی و جوانکاری لە مەتەڵدا:

١- باوای چەفت و چێڵ، دایەی سەرپانە کوڕیان شیرینە و کوڕەزا دێوانە

خواستن لە مێو / خواستن لە گەڵا / خواستن لە هەنگوورە / خواستن لە ئاوی هەنگوورە کە مەی لێ دروست دەکرێ.

٢- «ئەگەر هات پات خەبە مل پا/ ئەگەر نەهات خۆتیش ئەوا»

هات خواستن لە سامان و دارایی یان شانسە.

دوو وشەی (هات و نەهات) دژ یەکن.

٣- «دوو مەشعەل لە نێو یەك سەرای بێ دەر چوار پەلۆش هەن شەش لاشە و یەك سەر»

خواستن: مانگ و خۆر / خواستن: ئاسمان

وشەکانی پەلۆش و لاشە و سەر پێکەوە چاو لە یەکن.

---

* س.ئ. بەرکوتێکی مەتەڵی... ل٣٥

٤- «تۆڵ تەڕ، تەیمان تەڕ، ناڵەی شێر، ئاویەر کەڕ.» (ساز و دەهۆڵ)

لەم مەتەڵەدا «ناڵەی شێر» خواستن لە دەنگی دەهۆڵ پیتی (ت) چوار جار و پیتی (ر) پێنج جار دووبارە بووەتەوە.

٥- «هەم تەشتێکە هەم دەشتێکە.»

هەر دوو وشەی «تەشت و دەشت» خواستن لە سکە و کورتبڕی تێدایە و دوو وشەی «تەشت و دەشت» لە کێش و پیتی دواییاندا وەك یەکن، هاوڕوون (سجع متوازی).

٦- «تشتی من تشتە، بێ بەر و پشتە.»

دوو وشەی «تشتە» و «پشتە» هاوڕوون و وشەی تشت لە رستەی یەکەمدا دەتوانێ خواستن بێت لە سك.

٧- «دارێکم هەس دوانزە لەقی هەس، هەر لەقێکی سی گەڵای هەس، لە هەرساڵێکا سی دانە سێف دەرئەکا، ئەم سی دانە سێفە پانزەی چەرمگە و پانزەی رەشە، رەشەکانی حەڵاڵە و چەرمگەکانی حەرامە.»

دار: خواستن لە ساڵە. دوانزە لەق: خواستن لە دوانزە مانگە. سی گەڵا: خواستن لە سی رۆژەی مانگە. پانزە سێفی چەرمگ: خواستن لە پانزە رۆژە. پانزە سێفی رەش: خواستن لە پانزە شەوە.

لە نێوان وشەکانی: «دار» و «لەق» و «گەڵا» جوانکاری چاو لەیەك هەیە. لە نێوان «ساڵ» و «مانگ» و «رۆژ» و «شەو» چاو لەیەك هەیە.

٨- «هەنیکم کردووە بە ١٢ قاشەوە، یانزە قاشی حەڵاڵە و قاشێکی حەرامە.»

هەنی یان شووتی: خواستن لە ساڵە. دوانزە مانگ: قەرینەی سارفەیە.

٩- «دوو ئاهووی سیاە سەحراچەریدە جەفاکەر بەندە، حـەق ئافـەریدە
شانزە پارچــە چووب باڵاپۆشــەوە بەستە بە حەڵقـەی ئاسن پۆشەوە»

دوو ئاهووی سیاە: خواستن لە دوو گایە. جەفاکەر بەندە: خواستن لە جووتیارە.

١٠- «بێ قاچ و باڵە، کە دەمرێ گۆشتی حەڵاڵە.»

دوو وشەی «باڵە و حەڵاڵە» لە پیتی دواییدا وەك یەکن بەڵام لە کێش و ژمارەی پیتەکانا جیاوازن.

هاوسەر (مطرف)

١١- «شتێك هەیە لە چیایە، سیپاتی سپیانی تێدایە، ناوی گێزەر گیایە، جەرگم بووە کونکون، کوندەڵانم بێننە کن؟»

سپیاتی: درکەیە (کینایە)یە بۆ شێر. سپیان: درکەیە بۆ مەڕ. لە نێوان (سپیاتی و سپیانی) و (چیایە و گیایە) رەگەزدۆزی ناتەواویان تێدایە.

١٢- «بەسەر پیرەژن، بە چەنگ منالە، بە پشتی روستەم، نەتەوەی زاڵە؟»

لەم سێ رستەدا دەبینین «لێچوو» «ئەو» سێهەمین کەسی تاکە و پەڕاوە لەوچوو «پیرەژن، منالْ، پشتی روستەم» «لەوچوو»ن و ئامرازی لێکچواندن پەڕاوە و لێچوون.

١٣- «رەشە وەك قیرە، تیژە وەك تیرە، سپییە وەك شیرە؟»

شەو: لێچوو. وەك: ئەدات تەشبیە. قیر: لەوچوو. رەش: لێچوون. تیژ: لێچوو. وەك: ئەدات تەشبیە. تەیر: لەوچوو. خێرا و توند: لێچوون. سپی: لێچوو. وەك: ئامرازی لێکچواندن. شیر: لەوچوو. سپی: لێچوون.

١٤- «دەربێ ئاو کلیـــلی چێوە    نەچیر دەرچوو سەگ بوو پێوە»

تێڵ نیشانە بۆ داستانی حەزرەتی مووسا و پەڕینەوەی لە رووباری نیل.

١٥- «سەد کەس لە ژوورێکا درێژ و سپین، کلاوەکانیان قاوەیی و سوورن؟»

وشەکانی سپی و قاوەیی و سوور پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی بە یەکەوە گونجان و هاوچەشنییە و چاو لە یەکن.

١٦- «سەوزە وەك خەیار، بەرزە وەك چنار، ترشە وەك هەنار.»

لەم مەتەڵەدا سێ لێکچواندن هەیە: لە رستەی یەکەم و سێهەمدا کە وشەکانی «خەیار و هەنار» هاوڕوون لە کێش و ژمارەی پیت و پیتی دواییدا وەکوو یەکن.

١٧- «سایەقەی سامالْ هەوری فەرەنگی، دوو ئاو لە جامێ هەر یەك لە رەنگی.»

دوو وشەی «فەرەنگ و رەنگ» هاوڕوون و هاوکیشن. (متوازن)

١٨- «ئەداو هەزار بزلانە، شەوینە لەوەریانە، ملا کنا، پەشتەو کەشانە.»

ئەدا: دایك خواستن لە مانگ. هەزار بزلانە: خواستن لە هەزار ئەستێرە کە لەوەڕیان پەیوەندی بە بزنەوە هەیە. شەو پەیوەندی بە مانگەوە هەیە.

١٩- «هەلاران و مەلاران، هێلکە دەکەن لە داران بۆ فەقیر و هەژاران.»

دوو وشەی «مەلاران و داران» هاوسەر (مطرف)ن کە لە پیتی دواییدا وەکوو یەکن بەلام لە ژمارەی

پیت و کێشدا جیاوازن. دیسان دوو وشەی «مەلاران و هەژاران» هاوڕوو (متوازی)ن.

٢٠- «ئەگەر دێ گەدایە، دادەنیشێ پادشایە، کە دەڕوا بێنەوایە.»

کە دوو وشەی «گەدا و پادشا» دژ یەکی فەرهەنگی دروست دەکەن چونکە دووشەن هەر لە بنجدا، واتای دژ و پێچەوانەی یەك هەڵدەگرن.

٢١- «ئەڕوا بە ڕێوە پای نییە، هاوار دەکا زمانی نییە، فرمێسك دەڕژێنێ چاوی نییە.»

لەم سێ ڕستەدا: جوانکاری واتایی چاو لەیەك هەیە.

لە نێوان «ڕۆین و ڕێ» و «هاوار و زمان» و «فرمێسك و چاو» پەیوەندییەکی لە یەك نزیك و بە یەکەوە گونجاویان هەیە.

٢٢- «دوو بەزەقی، دوو بەرەقی، چوار دەچەقی، دوو دەلەقی.»

لەم مەتەڵەدا (واجآرایی) دەنگەڕازە (Alitration) هەیە.

پیتی (ق) چوار جار. پیتی (و) حەوت جار. پیتی (ه) هەشت جار. دووبارە بوونەتەوە و مۆسیقایەکی جوانی لە نێوان پیتەکاندا پێك هێناوە.

## سپاس و پێزانین:

**ئەم بەڕێزانەی خوارەوە کە ناویانم هێناوە زۆر بە دڵسۆزییەوە یارمەتییان داوم. هیوادارم وێنەیان زۆر بێت.**

✓ بەڕێز هاوڕێم ڕەحیم لوقمانی شاعیر و نووسەر بەسەر کتێبەکەدا چووەوە و لە ڕێنموونی دڵسۆزانەی کەڵکم وەرگرت و پێشەکی بۆ نووسیوە و منەتباری هاوکاری ئەوم.

✓ بەڕێز مەنسوور ڕەحمانی بە سەر کتێبەکەدا چووە و لە زۆر جێیان لە بۆچوون و ڕێنموونی جوان و دڵسۆزانەی کەڵکم وەرگرت.

✓ بەڕێز سەعید مەجیدی تەمەن ۷۵ ساڵ شاعیر و وەرگێڕ، لێزان و نوکتەزان، قسەخۆش و مەتەڵزان دڵگەرمی دام و هاندەرم بوو.

✓ بەڕێز دوکتۆر سەید ئەسعەد شێخ ئەحمەدی لە ڕێنموونی جوان و دڵسۆزانەی کەڵکم وەرگرت.

✓ بەڕێز ئێقباڵ عەزیزی جێگری بەرپرسی ئاسەواری فەرهەنگی سنە لە کۆکردنەوەی مەتەڵی ناوچەکانی هەورامان و لوڕستان و کرماشان و لەکدا یارمەتی دام.

✓ **سپاس و پێزانینم بۆ ئەو دڵسۆزانە کە چوومە ماڵیان و زەحمەتم پێیان داوە و سەریانم ئێشاند و**

**مەتەڵیان بۆم گوت و مەتەڵیان بۆ هێنام و لە کۆکردنەوەی مەتەڵەکاندا یارمەتییان دام هەتا هەتایە چاکە و پیاوەتییان لەبەر چاومە.**

✓ خانم کولسووم عوسمانپوور شاعیر و لێکۆڵەر کە مەتەڵی هەورامی بۆ هێنام و چۆتەوە بەسەر مەتەڵە هەورامییەکاندا و هەروەها خانم قەمەرناز زاهێدی کە کتێبی بۆ هێنام.

✓ عەلی سۆرابی مامۆستای زمان و ئەدەبیاتی فارسی کە مەتەڵی ناوچەی سەقز و دەوروبەری وەکوو (میرەدێ، تەمۆغە، زیویە، سەرا، تیلەکۆ، سەرشیو) بۆ هێنام کە دەماودەم لە پیرەپیاوان و پیرەژنانی تەمەن ٦٥ هەتا ٧٥ساڵ بیستبووی و کۆی کردبووەوە.

✓ یەحیا لوتفوڵڵانەسەب مامۆستای بیرکاری کە لە بەشی مەتەڵی بیرکاریدا یارمەتی دام.

✓ مامۆستای پایەبەرز و دڵسۆز یووسف رەهنەموون تەمەن ٦٠ ساڵ و کاک ئەحمەد ناسرئابادی لە گوتن و کۆکردنەوەی مەتەڵی ناوچەی مەریوان و دەوروبەری یارمەتیمان دا و زەحمەتی زۆرم پێیان دا. هیوادارم تەمەنیان درێژ بێت و وێنەیان زۆر بێت.

✓ موستەفا تاهێری بەرپرسی ئاسەواری فەرهەنگی شاری مەریوان کە مەتەڵی ناوچەی هەورامانی بۆ هێنام.

✓ سالار کۆهزادی خوێندکاری زانکۆی ئەهواز و خانم ماندانا مەسعوودی خوێندکاری زانکۆی ئەهواز مەتەڵ لەك و لوڕیان بۆ هێنام.

✓ جەعفەر فەتاحی تەمەن ٤٠ ساڵ دێگولان و موحەممەدعەلی ئەحمەدی تەمەن ٤٢ ساڵ کە مەتەڵی ناوچەی لەیلاخیان بۆم گوت.

✓ عارف مەجیدی تەمەن ٧٤ ساڵ کە چەن مەتەڵ و موعەممای شوێشە و دەوروبەری بۆم گوت و تۆمارم کرد. هیوای تەمەن درێژییان بۆ دەخوازم.

✓ عەبدولوەهاب حوسەینپەناهی تازاوای قروچا تەمەن ٧٤ ساڵ خوێندەوار دانیشتووی شاری سنە مەتەڵی ناوچەی لەیلاخی بۆم گوت.

✓ ئیبراهیم حوسەینپەناهی خەڵکی تازاوای قروچا تەمەن ٥٠ ساڵ نەخوێندەوار دانیشتووی شاری سنە کە مەتەڵی ناوچەی لەیلاخی بۆم گوت.

✓ مەحموود ناسری گەزگەزارە تەمەن ٥٤ ساڵ نەخوێندەوار دانیشتووی شاری سنە، مەتەڵزان، نوکتەبێژ، قسەخۆش کە مەتەڵ و موعەممای ناوچەی لەیلاخی بۆم گوت و تۆمارم کرد و زۆر زەحمەتم پێدا.

هیوادارم تەمەنیان درێژ بێت.

- ✓ موحەممەد ناسری گەزگەزارە شاعیر دانیشتووی شاری سنە تەمەن ٥٨ ساڵ مەتەڵی ناوچەی لەیلاخ و چەم شاری سنە.
- ✓ حەبیبوڵڵا ئەحمەدی سرنجیانە تەمەن ٧٥ ساڵ مەتەڵی چەم شاری سنە.
- ✓ فەتحوڵڵا زەندی باخچەمریەم تەمەن ٦٥ ساڵ دانیشتووی شاری سنە مەتەڵی ناوچەی لەیلاخ و سنە.
- ✓ ڕەشید شوجاعی تەمەن ٥٤ ساڵ مەتەڵی ناوچەی سنە.
- ✓ ساڵح کەریمی تەمەن ٥٠ ساڵ مەتەڵی ناوچەی دیواندەرە.
- ✓ کەیۆمەرس موحەممەدی ڕەوانسەری شاعیر کە موعەممای ناوچەی ڕەوانسەری بۆم هەنارد.
- ✓ ئەڵماس ئەمانی تەمەن ٥٨ ساڵ نوکتەبێژ و مەتەڵزان مەتەڵی ناوچەی کامیاران و چەم شاری سنە.
- ✓ خانم شەهین جەواهێری بەرپرسی بەشی مرۆڤناسی دایەرەی ئاسەواری فەرهەنگی کرماشان.
- ✓ موحەممەدڕەشید ئەمینی پاوە، شاعیر و لێکۆڵەر کە چەن مەتەڵی ناوچەی پاوەی بۆم هەنارد.
- ✓ تەوفیق بەهمەنی تەمەن ٥١ ساڵ مامۆستای بیرکاری قسەخۆش و نوکتەبێژ مەتەڵی ناوچەی لەیلاخ.
- ✓ خوشکی بەڕێز سومەییە تەیووری کە کاری پیتچنین و ڕازاندنەوەی لاپەڕەکانی بەئەستۆ گرت و زەحمەتی زۆری کێشا.
- ✓ خێزانم بەهیە سەڵەواتی و منداڵەکانم وریا و نینا کە لە نووسینەوە و پاکنووسی مەتەڵەکاندا بە هانامەوە هاتن و یارمەتییان دام.

## خوێنەرانی هێژا!

لەم فەرهەنگەدا لە برێ شوێن ئەگەر ویستبێتم ئاماژە بکەمە سەرچاوەیەك تەنیا لە یەك «پیت» کەلکم وەرگرتووە وەك ئەوەی ئەگەر نووسرابێت «ئـ» مەبەست ئیبراهیم ئەفخەمی دانەری کتێبی ئەوە چییە؟ بووە یان لە شوێنێك نووسرابێت «ن.مەریوان» مەبەست ناوچەی مەریوان بووە.

کورتکراوەکانی هەمووی ئەو جۆرە وشانە لە خوارەوە نووسراون:

**کورتکراوی ناو و سەرچاوەکان**

**١- ب: عەبدوڵڵا ئەیووبیان بەڕڕک**

**٢- ئ: ئیبراهیم ئەفخەمی**

**٣- م.ئ: مەحموود ئەحمەدی دێگولان**

**٤- هـ: هۆشیار نووری لەک**

**٥- ف: فەرهەنگی زارەکی موکریان**

**٦- س.ئ: سەدرەدین نوورەدین ئەبووبەکر**

**٧- ن.سەقز: ناوچەی سەقز**

**٨- ن.مەریوان: ناوچەی مەریوان**

**٩- ن.هەورامان: ناوچەی هەورامان**

**١٠- ئەردەڵانی: ناوچەی لەیلاخ و سنە**

**١١- ن.جوانڕۆ: ناوچەی جوانڕۆ**

**١٢- ن.پاوە: ناوچەی پاوە**

**١٣- لوڕی: لوڕستان**

**١٤- لەکی: لەکی**

**١٥- کرماشان: کرماشان**

**١٦- موکریان: موکریان**

**١٧- کـ.ژ: کرمانجی ژووروو**

# ئـ

| | |
|---|---|
| ١- ئەو پیاوە کێیە کە دایك و بابی نییە.<br>٢- بپرسن لە عەقڵ بەسەران/ بەرخ مێیە و دایك بەران.<br>٣- دنیا بە چەرخ و فەلەك ئەگەڕێ/ بەرانە و دایکی مەڕێ. (ف.١١٣)<br>٤- سێحەبی وەلەدەو، لە دایك و باب بە وەلەد نەبووە. (ف.١١٣)<br>٥- هەر لێرە تا مازندەران/ بپرسن لە عاقڵ بەسەران/ بەرخ مێیە و دایك بەران. (ف.١١٣) | ئادەم |
| چارەکەیکم هەیە گۆشاوگۆش، پڕە لە کاژیلە گۆش. (ن.سەقز) | ئاسمان و ئەستێرە |
| ١- ئەگەر عەقڵت هەس و عەقڵت ها پێوە!/ پیرۆزەس و سێ شتی ها پێوە. (ئەردەڵانی)<br>٢- چارۆکەیەك چوار گۆشە/ پرییە لە وردەپێشە.<br>٣- لێفە شڕێك بە حەواوە، بە هەزاران پینەی لێدراوە. (هـ.٤٧) | ئاسمان و ئەستێرەکان و مانگ |
| تەختی شینە پاشای زێڕین. (س.ئـ. ) | ئاسمان و خۆر |
| بەحری شینە، دوو پاپۆڕی لێدا بە زینە، یەك ئەسپە یەك مانییە. (هـ.ن.١٠) | ئاسمان و ڕۆژ و مانگ |
| ١- بەحرا شینە، ئاڤتێ نینە، دوو مار تێدا خشینە، ئێك هەسپە، ئێك ماهینە. ك.ژ (س.ئـ.٥٤)<br>٢- بەحری شینە/ دوو پاپۆڕی لێ دابەزینیە/ یەك هەسپە، یەك مایینە. (س.ئـ.١١٩) | ئاسمان و مانگ و خۆر |
| سوور دەکرێتەوە، کەچی ناخورێ. (هـ.٣٤) | ئاسن |
| هندی بکەنێ تژی نابت، هندی بدەنێ تێر نابت. ك.ژ (س.ئـ.١٧٩) | ئاش - مقەس - ویستەکانی مرۆڤ |
| ئەوەڵەکەی چێشتی ئێرانە، دووەمەکەی سەرمایەی ژیانە. (ن.سەقز) | ئاشکار |
| ١- ئەسپە ڕەشەی بەر تاوان/ ڕۆژی دەخوا چل مەن دان. (ف.١٦٥)<br>٢- ئەسڵی لە شاخانە/ ڕزقی لە ماڵانە/ ئاوی لە چۆمانە. (ب.٧)<br>٣- باڵی لە شاخانە/ ئاوی لە چۆمانە/ خواردنی لە ماڵانە. (ف.١٥١)<br>٤- چوومە سەر بەردێ/ ڕوا نیم لە زەردێ/ دارێ بە چەپۆك بەربووە لە بەردێ. (هـ.١٩)<br>٥- کەوێ لە بنە دەوێ ئەقروسکێنێ، دانی ئەوێ. (ن.مەریوان)<br>٦- لە جۆزەردان، لەبەر دەردان، ئەبینم هەردە چەپۆکی لەسەر بەردە. (ن.مەریوان) | ئاشی ئاو |
| ئەوە چییە کە شەو و ڕۆژ دەستی نیاگە کەمەری و وەستاوە؟ (ئەردەڵانی) | ئافتاوە |
| برامە و باوکیشم یەك کوڕی هەیە. (ن.مەریوان) | ئافرەت |
| گایان کوشت بە پاییزێ، کەوڵیان کرد بە بەهارێ. (هـ.٤٤) | ئافرەتێك بە ناوی بەهار کەوڵی کرد |
| گای ڕەش لە پێشەوە، گای سوور لە پشتەوە؟ (س.ئـ.١٥٢) | ئاگر و دووکەڵ |

٤٣- سێ کەس دوو سێویان خوارد، هەر یەکە سێوێکیان بەرکەوت. (هـ.٢٣)

٤٤- سێ گا، نۆ گای خوارد. (هـ.٣٤)

٤٥- ئەلف) دە بوو دوو، دوو بـوو دە، سـەر لە ژێر لەش، لەش لەسەر عەرز ئەمە چەس؟ (ئەردەڵانی)
ب) سەر لە بن قوونی، قوون لەسەر بەرد، بە دەیان بۆ دووبان دەچێ. (ب.٣٩٩) پ) سەری لە بن لەشیە، لەشەی لەسەر زەوییە، بە دەیان دادێنە دووان. (هـ.٣٣)

٤٦-

باوك پێچ پێچ و دایـك لار و گێڕ　　　　لە ترش و شیرین لێ بارکە بە تێڕ

(موکریانی) (ئـ.٣٧)

٤٧- زانیار دەیەویست لە مێوانی زاوای باوك ژنەکەیدا کە تەنیا کەنیشکی بوو بەشداری بکات روونی بکەرەوە مێواندارەکە کێیە؟ (ئەردەڵانی)

٤٨- شۆفێری ئوتۆبوسێك، چل مسافری لە ئیزگەیکدا هەڵگرت و لە رێگا چوار دەکەسی داخۆزاند، کاتێ کە گەیشتنە بەرەوە مسافرێ لە نێو ئوتۆبوسەکەدا نەمابوو، تۆ بێژە باقی مسافرەکان چییان لێ هات؟ (ئەردەڵانی)

٤٩- پیاوێك، پەزێك و سەوەتەیەکی ئالف و گورگێکی پێ بوو. گەرەکی بوو لەگەڵ ئەمانا بە بەلەمێك لە چەمێکەوە بکاتە ئەو بەرەوە. بەلەمەکەیش تەنیا جێگەی دوو شت یان دوو کەسی تیا دەبووەوە. بێژە چلۆن ئەمانە بکاتە ئەو بەرەوە کە نە گورگەکە پەزەکە بخوا و نە پەزەکە ئالفەکە. (ئەردەڵانی)

٥٠-

چییە وەك دارای زۆر تەماعکارە　　　　زکی پڕە لـــە ئاو لێوی وەبارە

(ئەردەڵانی)

٥١- پیاوێك لە بەین شەش خانمدا دانیشتگە منیش پرسیاری لێ ئەکەم کاکە گیان تۆ بە ئەم خانمگەلە مەحرەمی یا نامەحرەمی، ئەو ئەیژێ کاکە مەحرەمم، چون دووانیان کەنیشکمن. دووانیان خویشکمن و دانەیکیان دایکمە، دانەیکیانیش خێزانمە، بەڵام ژنەکەم دایك ئەو پەنجەکەیترە یانێ چی؟ (ئەردەڵانی)

٥٢-

سێ سفرە لەســــەر رایە　　　　جیرانی ئـــــەلف و بایە
بێ نوون مانایی نایە؟

(هـ.ن.٣٣)

٥٣- سوورە رەنگ ناکرێ، شیرینییە قووت نادرێ، تاڵە فڕێ نادرێ، تەڕە و وشك نابێ، لە لاتە و ون نابێ. (هـ.ن.٣٤)

٥٤- گەلێ کۆتر دێن، ٣٦ کۆترن، کۆترێکیش لە ناو جاڕێکدا خەریکە چینە ئەکا، ئەو کۆترەکە چینە ئەکا پێی ئەڵێن کۆترە شەل، قاو ئەکا ئەی گەلی سەد کۆتری بۆ کوێ ئەڕۆن؟ ئەوان ئەڵێن چۆن ئەزانی ئێمە سەد کۆترین. ئەڵێ ئەزانم سەد کۆترن. گەلە کۆتر وەڵام ئەدەنەوە نەخێر وانییە ئێمە و ئەونەی ئێمە، نیوەی لە ئێمە و نیوەی لە نیوەی ئێمە و تۆیشمان بێتە سەر ئەبینە سەد کۆتر. (ئەردەڵانی)

٥٥-

| | |
|---|---|
| دوو ئاهووی سیاە سەحرا چەریدە | جەفاکەر بەندە حـــەق ئافەریدە |
| شانزە پارچە چووب باڵاپـــۆشەوە | بەستە بە حەڵقەی ئاسن پۆشەوە |

(ئەردەڵانی)

٥٦- دوو دەروێش ئەچن بۆ رۆن چنینەوە و سێ خییە رۆنی دە مەنی و حەفت مەنی و سێ مەنییان پێ ئەوێ و خییە دە مەنییەکە پڕ ئەکەن لە رۆن. ئەم دوو کەسە جیایی ئەکەوێتە نێوانیان و ئەڵێن ئەبێ رۆنەکە بەش کەین. یەکێکیان ئەڵێ سەنگ و تەرازوومان پێ نییە و ئەویتر ئەڵێ هەر بەم سێ خییە بەشیان ئەکەین. بڵێ چۆن بەشی بکەن؟

٥٧- **ئەلف)** دارە بەنێ، لەسەر بەنێ، میر و حاکم دەست دەکەنێ؟ (س.ئـ.٥٥) ب) دارە بەنێ لە قەد کەنێ، شێخ و مەلا دەستی ئەدەنێ؟ (س.ئـ.٥٥) ج) هەلاران و مەلاران، هێلکە دەکەن لە داران، بۆ فەقیر و هەژاران. (موکریان) د) هەیاران مەیاران یاخوا داکاتە باران بۆ فەقیر و هەژاران. (موکریان)

٥٨-

| | |
|---|---|
| مەتەڵ نۆ پیتە بە ئیـــــــملای کوردی | بیری لێ بکەرەو بە جـوانی و وردی |
| لەو خۆشەویست تر لە ئـــــەو جوانتر | لە رووی جیـــهانا ناوێنی ئـــــیتر |
| چوار و پێنج و شەش چاوەڕێ کـەی بێ | نۆ و هەشت و دوو کەس نییە نەیبێ |
| شتی حەمامە حەفت و هەشت و شەش | یەك و دوو سێهەم خـــوا لێ بێبەش |
| پیتی چوار و هـــــەشت و شـــەشەمی | چەکی سەپانە و لابـــــەرێ خەمی |
| شەش و هەشت و نـــــۆ لە هەورامانە | نۆ و هەشت و سێ میـــوەی زستانە |

(م.ئـ.٢٠٩)

٥٩-

**ئەلف)**

سێ شێر و یەك سەر، چوار پا و دوو دەس | یەك شێر دوو شێرش گرتن بە ئەنقەس
کاتێ یەك بە دوو مەدەرۆ فشار | جەو دو مەخیزد و فەریاد و هاوار
جە تاو و دەشت ندار و قرار | ئەسرین ئاگر مەرێزو و بەوار
جەو ئەسرین مەبۆ خەلق زیبا و زشت | پای ها لە شکم دەسی ها لە پشت

(م.ئـ.٢٠٤)

ب) هەناسەی هەیە، رەوانی نییە، پەراسووی هەیە، گۆشتی نییە، مەمکی هەیە، شیری نییە. (ب.٢٣)

٦٠-

ناو هەرکەسێ بە حەرفی ئەبجەد | نۆ نۆ بژمێرە لە نیك و لە بەد
هەر کەسێ ئەگەر کر دو بمێنێ | پشتی خاوەنی چوار ئەشکێنێ
یەکێ حەفتی ما یەکێکیتر نۆ | حەفت سەر ئەکەوێ وایە بێ درۆ
تالب هەر دوو ما مەتلووبش هەر دوو | مەتلووب ئەیباتە و هەروا زوو بە زوو
تالب و مەتلووب کاتێ یەکسان بوون | تالب ئەیباتەو وەبێ چەند و چوون

(م.ئـ.٢٣٢)

٦١-

شارێکە ئەر ژن لاوەی لە بانی | ماباقی ئەبن گشت بە رۆحانی
وەلێ ژن وەها چووەتە گیانی | وێرانیشی کەی ژن ها دووشانی

(ئەردەڵانی)

٦٢-

گیانلەبەرێکە فرە نەفامە | هەڵیگەرنیتەو کل و مەرامە
قەلبی دەربێری ئەوێتە مالك | نیمەی کەی بووری مارێکە هالك

(ئەردەڵانی) (م.ئـ.٢٢٣)

٦٣-

دوو شارە وان لە ئێرانا | ناو مەلێکی زۆر جوانە

(ئەردەڵانی) (م.ئـ.٢٢٤)

٦٤-

نێوی شارێـــــکە فرە دڵنشین　　　سەری داپۆشی ئەبێتە هەنگوین

(ئەردەڵانی) (م.ئـ. ٢٢٤)

٦٥-

شاری مێژووی دەورەی هوەخشتر　　　دووی لیٚ لابـــــەی ئەوێتە وشتر

(ئەردەڵانی) (م.ئـ. ٢٢٥)

٦٦-

ئەر گەرەکتە ناو ئەو خاوەن ئەدەب　　　قلب قلب بـــدە تو لە قلب قلب

(ئەردەڵانی) (م.ئـ. ٢١٩)

٦٧-

یار هاتە چەمـــەن بەیانی تەنیا　　　چەمەن دامەنی کێشا بە سەریا

(ئەردەڵانی) (م.ئـ. ٢١٥)

٦٨-

دوو بەرد لەسەر یەك دوو لوولە تفەنگ دوو چرای رۆشن

تیـــر و کەوان تەختی سولەیمان سەوزە و چیمەن

(م.ئـ. ٢١٥)

٦٩-

شارێکی خۆشناو مشـــبت و منـــفـــی　　　لەم سەر و لەو سەر مەعنای دوو حەرفی

سەر هەڵەوخشنی قیمەت ئەبەخـــشی　　　دیـــــــوار برمێنی (قووت) ئەبەخشی

گەر بیٚ بناغەی هەڵگیری و گـــوم بیٚ　　　ناوی بـــولەندی ئـــــەو کاتە هەڵدیٚ

(ئەردەڵانی) (م.ئـ. ٢٠٩)

٧٠- ناوێکە دوو بەشە، بەشی ئەوەڵی بۆ رێگە و روێنی مرۆڤ و گیانلەبەر و پەلەوەر پێویستە، بەشی دووهەمی هەر کە بیژنەوی قەڵس ئەبی، لەگەڵ سەرا گەورەی قەومە، ئەوێتە ناو بۆ کەسیٚ سەری ئەلەرزی.
(ئەردەڵانی)

-٧١

گا چەوێل شـــای ئەردەوێڵ          نێڵە بنە ملی بیکیشە هێڵ

(ئەردەلانی)

-٧٢ سەد تمەنیان پێت داوە کە دەبێ سەد سەر حەیوانیان بە ئەم نرخانەی خوارەوە بۆ بکڕی: وشتر لە سێ تمەن، پەز لە یەك تمەن و بزن لە ٥ قران. ئێستا دەبێ لە هەر کام لە ئەم حەیوانانە چەند سەر بستێنی کە هەم پوولەکەت پڕ بکەیتەوە و هەم ژمارەی حەیوانەکان بگاتە سەد سەر. (ئەردەلانی)

-٧٣ پیاوێك بە دەمانچە پیاوێکیتر ئەکوژێت، هەڕا دەکاتە ناو ئوتۆبوسێ و لە جێگایەکەوە دادەنیشێ. پۆلیس دوای ئەکەوێت و لە ناو ئوتۆبوسەکەدا یەك ڕاس دەستگیری دەکات و هەڵیدەستێنێت بەڵام پاسەکە پڕە لە خەڵك، پۆلیسەکانیش تەنیا ئەو کەسە هەڵدەستێنن کە کابرای کوشتووە... بۆ؟! (موکریان)

-٧٤ پاشایەك دەبێت، پاشاکە سەفەرێك دێتە پێشی ئەو شەوە پاشا خۆی ئامادە دەکات کە بۆ بەیانی بڕوات بۆ سەفەرەکەی. ئەم پاشایە حەرەسێکی زۆر زیرەکی دەبێت. لە پڕێکا پاسەوانەکەی دێتە ژوورەوە و تکا لە پادشا دەکات و دەڵێت ئەم ڕۆ مەڕۆ بۆ سەفەرەکە، کە پادشا دەڵێ لەبەرچی نەڕۆم؟ پاسەوانەکە دەڵێ ئەم شەو خەوێکم پێتەوە بینیوە بڕۆی دەتکوژن. پاشا بە گوێی دەکات و ناڕوات بۆ سەفەرەکەی! بەڵام پاشا خەڵاتی دەکات و لە دوای خەڵاتەکە دەری دەکات لە لای خۆی. پرسیار؟ زانیمان خەڵاتەکە لەبەر ڕزگارکردنی ژیانی پاشاکە بوو. بەڵام بۆچی لە لای خۆی دەری دەکات؟ (موکریان)

-٧٥ لە مەیدانێکی پڕهاتوچووی شاردا دوو شۆفێر خۆ ئەکێشن بە یەکا بەڵام پۆلیسی هاتوچوو هیچیان پێ ناڵێت تەنانەت قسەشیان لەگەڵ ناکات لەبەرچی؟ (موکریان)

-٧٦ دوو ژن سلام لە دوو پیاو دەکەن، دەڵێن: (ماندوو نەبن باوکەکانمان، مێردەکانمان) بۆ وا ئەڵێن؟ (موکریان)

-٧٧ مووچەخۆرێك لەگەڵ ژنەکەی، بەرپرسی لەگەڵ خوشکەکەی سێ سێو دەکڕن هەر یەکە دانەیەکیان بەرئەکەوێ. بڵێ چۆن؟

-٧٨ هەنیکم کردووە بە ١٢ قاشەوە، ١١ قاشی حەڵاڵە و قاشێکی حەرامە. (ئەردەلانی)

-٧٩ وەك شەو ڕەشە، وەك بەفر چەرمگە، پەنج حەرفییە، حەرف ئەوەڵی میمە، چەن جار لە قورئانا ناوی لێ براوە، خواردنی حەڵاڵە، خواردنەوەی حەرامە، لە پیاوا ڕۆژێ سێ کەڕەت و لە ژنا لە ماوەی تەمەنیدا یەك جارە. (ئەردەلانی)

٨٠- کابرایەك لەسەر تاوانەکانی، حاکم حوکمێکی بەسەردا ئەدات، دەڵێ سێ مانگ زیندانی بێ. نە ئاو نە هیچ خواردنێك نابێ بخوات، بەڵام رۆژێ یەك جار ژنەکەی سەردانی بکات.

٨١- ئەدا و هەزار بزلانە، شەوێنە لەوەڕیانە، ملاگنا، پەشتە و کەشانە. (ن.هەورامان)

٨٢- کەشی وەروینوو سەردا، کانگای تلای چەرمە و زەردا. (ن.هەورامان)

٨٣-

| | |
|---|---|
| یەك دانە مردوو سێ دانە زیندوو | هەر چوار مەشغووڵ هەن بە گفتوگۆ |
| زوانی مردووەکە ئینسان ئەیزانێ | لە سی زیندووەکە کەس حاڵی نەبوو |

(ئەردەڵانی)

٨٤- دوو شۆفێر لە سنەوە هاتن هەر یەك سوار ماشینێك بوون و ماشینەکانیان چەشنی یەك بوون و بە دوای یەکدا ئەهاتن لە نێو رێگەدا پۆلیس بەر ماشینە بەرگینەکەی گرت. داوای تەسیقەکەی لێ کرد، ئەویش دای بە دەستیەوە و وتی ئەو شۆفێرە دوانگینە چیتە وتی برامە، ئەوی ئازاد کرد و بەر شۆفێرە دوانگینەکەی گرت. پۆلیس وتی لەگەڵ شۆفێرە جلەوگینەکەدا بران؟ دووهەمی وتی من لە بنەڕەتدا برام نییە، ئێستا بڵێ ئەم دوو شۆفێرە چی یەکن؟ (ئەردەڵانی)

٨٥- پیاوێك ماڵێکی زۆری بوو، شەوێ دز رۆیی هەموو ماڵەکەیانی برد وتیان شکت بۆ کێ ئەچێ با بیگرین، پێنج کەسی دا بە داوا و وتی: دڵم لەمانە پیسە. پێنج کەسەکەیان برد بۆ لای قازییەکی ژیر. ئەویش پێنج داری یەك متری پێ دان و وتی: بیبەنەوە لە ماڵەوە داینێن، حەفتەیەکتر بێن و دارەکان بێرنەوە هەرکامتان دز بێ دارەکەی دوو پەنجە زیاد ئەکات و قازی دوای یەك حەفتە توانی دزەکە پەیا بکات. بڵێ چۆن؟ (ن.مەریوان)

٨٦-

| | |
|---|---|
| تـــــــــەوەرم هەڵـــــگرد چووم بۆ دار | هاتە نـــــــــاو رێگەم گـــــــورگی هار |
| من بە تــــــــــەوەر و ئـــــــەو بە دار | دامـــــــان لە یـــــــــــەك تا ئێوار |
| چووم ئیبراهیم ئاغا، مەحبووبی لە لاو وێستابوو | رۆن و کــــــــــەرەی دانـــــــــــــابوو |

مریشکیش لە لاوە هات، هەرچی وتم کشەکشە بە دەنگی من هەڵنەنیشت.

| | |
|---|---|
| تــــــــــــەوەرێکم دا بە پشــــــتیا | سی گـــــــــــەز زوانی دەرکێـــــــشا |
| کــــــــەڵەشێر ئەیـــــژێ قـــوو بە قوو | بـــــــە دەنگی من هـــــەڵسە زوو بە زوو |

(ئەردەڵانی)

٨٧-

| | |
|---|---|
| وتم نێوت چییە کیژی کــوردی لادێ | لە رووی لێوت بەدەگمەن پێکەنین دێ |
| وتی شەوگار ونم فرمێســـــکەکانم | لە من نابڕن هەتا کـــۆتایی ژین دێ |

(ن.جوانڕۆ)

٨٨-

شینی نێوت شین دەگێڕێ یاری شۆخ و شەنگی من     یا لە نێو یاری دەلابە بـــۆ دڵەی وەك سەنگی من

واوی نێو من دەکـــــا دێوانە وەك واوی وەلی     ئات لە نێو ئاوێنە تێکەڵ بوو لە وێنە و رەنگی من

نێوی دڵـــــــــــداری شاعیر چییە؟

(ن.جوانڕۆ)

٨٩- نان و شەوێ رۆنە بڕیو، پانزە روێ جا ورێو. (ن.هەورامان)

٩٠-

| | |
|---|---|
| حوقەی مونەوەر حوقەی مـــونەوەر | دیم لە شار چین حوقـــەی مونەوەر |
| غەواسی نشتەن چەنی دوو لـەنگەر | گەوهەر لە دەریا مـــاوەرو وەبەر |
| غەواس دوو شاخی بەسەر سـەرەون | هەم دوم و شاخش و گـەوهەرەوەن |
| گەوهەر ماوەرو ئەو لە دەریای چین | مینو خزینە لە کافـــور زەوین |
| ئانە گەوهـــەری لە دەریای چیـــنن | ئەی گەوهەر نامش (حبل المتینن) |
| هەرکەس حەقیقەت بوانو گــەوهەر | لە هەر دوو دونیا مـەبو بەختەوەر |

(م.ئـ.٨٠٣)

٩١-

| | |
|---|---|
| شیرین بی خەوە شیرین بی خەوەن | مەلیك ئەنـــاسم دایم بێ خەوەن |
| دائم الــــــدوام لە دەوان دەوەن | رزق گشت عالەم بە دەسی ئەوەن |

(م.ئـ.٢١٩)

٩٢- پیاوێ نوێژی ئەکرد سلام لای راسی داوە و نوێژەکەی بەتاڵەو بوو، سلام لای چەپی داوە تەلاقی کەفت، سەری هەڵبڕی رۆژووەکەی شکیا. (ئەردەڵانی) (م.ئـ.٢٢٠)

-٩٣

چییە هیچ کاتێ بێـــــــکار نانیشێ ئەگەر بێکار بێت جێگەیەکی ئەیشێ

(ئەردەڵانی)

-٩٤

سی حەرفە ئەگـەر وەری بگێڕێ نۆ دانە مانـــا تیا دەرتێری

(ئەردەڵانی)

٩٥- ماڵێکمان هەیە سپی پڕ لە خاڵ دوانزە پای هەیە و سێسەد و شەست و پەنج باڵ. (ن.سەقز)

٩٦- هەتا بیبەخشی زیاد ئەکات. (ئەردەڵانی)

٩٧- پەنج فریشتە، ئاهووی یەك رەنگە بردنە بان سارای سفی رەنگە ئاهوو دوو شاخی هاوە سەرەوە، بان شاخەکانی بە گەوهەرەوە. (ن.سەقز)

٩٨- ئەوە چییە لە دووەوە ئەچێتە چوار، لە چوارەوە ئەچێتە سێ، لە سێیەوە ئەچێتە چوار هەروا دێتەوە دوو. (ن.سەقز)

٩٩- چناری بێ سایە، کچی بێ دایە، توجاری بێ مایە. (ن.سەقز)

١٠٠- دووکانێکمان هەیە سێ فرۆشیاری هاتیا: ئەوەڵی چەرم ئەفرۆشێ، دووهەمی کاغەز ئەفرۆشێ، سێهەمی یاقووت ئەفرۆشی. (ن.سەقز)

١٠١- تفەنگی یەك لوولە، بەرەو خۆت ماشەکەی مەکێشە کە مایەی دەرد و ئێشە. (ن.سەقز)

١٠٢- زیندانێك دوو درگای هەیە، درگایەکیان بەرەو ئازادبوونە، درگاکەی دیکەیان مەرگە، لە هەر دەرگەیەکدا پاسەوانێك هەیە، درگاوانێکیان هەرگیز درۆ ناکات و ئەوەی دیکەشیان هەرگیز راست ناڵێتە ئەگەر یەکێك لە ناو زیندانەکەدا بەند کرابێت و نەزانێت کام درگا بەرەو مردنی دەبات و کامە دەربازی دەکاتە نەشزانێت کامە پاسەوان راستگۆیە و کامەشیان درۆزنە، بەڵام بۆی هەبێت تەنها پرسیارێك لە پاسەوانێکیان بکاتە چ پرسیارێك دەکات بۆ ئەوەی درگای دەربازبوون بدۆزێتەوە دەرباز ببێت؟ (ئەم موعەمما لە فارسیدا هەیە) (س.ئـ.٢٢٢)

١٠٣- یەکەو نابێتە دوو، دووەو نابێتە سێ، سێیەو نابێتە چوار، چوارەو نابێتە پێنج، پێنجەو نابێتە شەشە، شەشەو نابێتە حەفت، حەفتەو نابێتە هەشتە هەشتەو نابێتە نۆ، نۆیە و نابێتە دە، دەیەو نابێتە

یازدە، یازدەیەو نابێتە دوانزە، دوانزەیەو نابێتە سێنزە. (س.ئـ.١٠٢)

١٠٤- بە پێی خۆم دەچمە ماڵی خەڵکی و بە پێی خەڵکی دەچمە ماڵی خۆم. (س.ئـ.١٠٤)

١٠٥- خەڵکی شارێك نە مردوویان لێ دەمرێ و نە ئارد لە ئاش دەکەن، ناوی شارەکەم پێ بڵێ. (س.ئـ.١٠٥)

١٠٦- یەکێك بێ دایك و بێ باوکە، یەکێك بێ باوکە، یەکێکیش دایك و باوکی هەیە. (س.ئـ.١٠٦)

١٠٧- یەکێك شۆفێری ماشینی ئەکرد و منداڵێکی لەگەڵدا بوو، لێیان پرسی ئەو منداڵە چی تۆیە؟ ئەویش وتی: کوڕی منە و منیش باوکی نیم. (س.ئـ.١١١)

١٠٨- سێ کاروانچی بە رێگەدا دەڕۆیشتن، خەریك بوو لە برسانا بمرن، گەیشتنە کەلاکی کەرێکی تۆپیو یەکێکیان تێر گۆشتی کەری تۆپیوی خوارد، دووەمیان تا نیوە تێر بوو خواردی بۆیان حەڵاڵ بوو، بەڵام سێیەمیان هیچی نەخوارد چونکە بۆی حەرام بوو!؟ (س.ئـ.١١٣)

١٠٩- ژن و مێردێك لەسەر روخی رووبارێك دەپەڕینەوە، پیاوەکە تەڵاقی لە ژنەکەی خوارد کە نابێ لەم ئاوە بپەڕێتەوە، پیاوەکە پەڕییەوە، دواتر ژنەکەش پەڕییەوە و تەڵاقی مێردەکەشی نەکەوت. (س.ئـ.١١٣)

١١٠- پیاوێك بەرامبەر دوو ژنی رووت دانیشتبوو نەزەری ژنەکانی بۆ حەرام بوو، بەڵام کە ژنەکان سەیری پیاوەکەیان دەکرد، نەزەریان حەرام نەبوو. (س.ئـ.١١٣)

١١١- نیوەی هەزاری چوارسەد و بیست و پێنجە. (س.ئـ.٢٢٥)

١١٢- دوو پیرەژن بە یەکەوە سەبەتەیەك هێلکەیان هەبوو، ئەگەر پیرەژنی یەکەم دوو هێلکە بداتە پیرەژنی دووەم ئەوا ژمارەی هێلکەکانیان یەکسان دەبێت ئەگەر پیرەژنی دووهەم دوو هێلکە بداتە یەکەم ئەوا ژمارەی هێلکەی یەکەمیان دەبێتە دوو ئەوەندەی دووەمیان. (س.ئـ.٢٢٧)

١١٣- نەخۆشێکی شڕ داوای سێوی دەکرد، لە باغێکدا سێویان دەفرۆشت بەڵام لە رێگەی باغەکەدا لە حەفت دەرگایان گومرگیان وەردەگرت، هەر دەرگەیەك بە جیا نیوەی سێوەکانیان وەك گومرگ لە کڕیارەکە دەستاند، دەبێت چەند سێو لە باغەوانەکە بکڕن بۆ ئەوەی سێوێك بگەیننە دەست نەخۆشەکە. (س.ئـ.٢٢٨)

١١٤- پیاوێك ١٥ سەر مەڕی هەبوو کە مرد کوڕێك و کچێك و ژنێکی لە پاش بەجێمابوو، رای سپاردبوو

دەبێ نیوەی مەڕەکانی بدرێتە کوڕەکەی و چواریەکی بۆ کچەکەی بێت و پێنج یەکی بۆ ژنەکەی بێ، بەڵام دەبێ هەر کەسیان بە بێ لە یەکتری کرینەوە و بە بێ زیاد و کەم بەشی خۆیان وەربگرن. (س.ئـ.٢٢٨)

١١٥- چل کەس، پیاو و ژن و منداڵ تێکەڵاو بوون، چل سێویان بە سەردا دابەش کردن هەر پیاوێك دوو سێویان داێی و هەر ژنێکیش سێو و نیوێك و هەر منداڵێکیش نیو سێو، هەر کەسەو بەشی خۆی وەرگرت، ئایا چەندیان پیاو و چەندیان ژن و چەندیان منداڵ بوون بۆ ئەوەی چل سێو بە سەر چل کەسدا دابەش بکرێت؟ (س.ئـ.٢٢٩)

١١٦- بە سێ گیانلەبەران، سێ سەر و شەش چاو و دوو لاقیان هەیە؟ (س.ئـ.٢٣١)

١١٧- دە لە دەیان دەربێنی دەمێنێتەوە دە؟ (س.ئـ.٢٣١)

١١٨- سێ کەس بە سەر پردێکدا پەڕینەوە، یەکەمیان پردەکەی بە چاو دێت و بە سەر پردەکەدا ڕۆیشت و پێی بەر پردەکە کەوت و پەڕییەوە، دووهەمیان پردەکەی دی بەڵام پێی بەرنەکەوت و پەڕییەوە، سێیەمیان نە پردەکەی دی نە پێی پردەکە کەوت کەچی پەڕییەوە؟ (س.ئـ.٢٣٤)

١١٩- لە کچێکیان پرسی: دایکت بۆ کوێ چوو؟ ئەویش گوتی: چووە دۆستی بکاتە دوژمن، یەکێ بکاتە دوو، دێتەوە دووان دەکاتە یەك؟ (س.ئـ.٢٣٤)

١٢٠- پیاوێك لە دەرەوەی وڵات گەڕایەوە، ژنەکەی پێی وت: پیاوەکە چیت بە دیاری بۆ هێناوم؟ ئەویش گوتی: هەگبەکەم بکەوە شتێکی وەك خۆت جوانم بۆ هێناوی. کوڕەکەی گوتی: باوکە چیت بۆ من بە دیاری هێناوە؟ ئەویش گوتی: هەگبەکەم بکەوە شتێکی وەك خۆت شیرینم بۆ هێناوی. کچە بچکۆلەکەشی گوتی باوکە ئەی بۆ من چیت هێناوە؟ باوك: هەگبەکەم بکەنەوە شتێکی وەك خۆت ناسك و نازدارم بۆ هێناوی. ئایا چی بۆ هێنابوون؟ (س.ئـ.٢٣٥)

١٢١- پیاوێکی سەر رووت بۆ چارەسەری قژوەرین چووە لای دوکتۆر، دوکتۆریش سەیری کرد و دەرمانێکی بۆ نۆوسی و گوتی لە دەرمانخانەکەی ژێرەوەمان دەرمانەکە بکڕە، کابراکەش چووە دەرمانخانەکە و چاوی بە خاوەنی دەرمانخانەکە کەوت، دەرمانەکەی نەکڕی و کاغەزی دوکتۆری دڕاند و چووە دەرەوە. بۆ دەرمانەکەی نەکڕی. (س.ئـ.٢٣٥)

١٢٢- پاشایەك ویستی راوێژکارێکی بکوژێت، وەزیرەکانی لە دیوانێ کۆکردنەوە و گوتی: دوو کاغەزم

نووسیون و خستوومەتە نێو قووتییەك، لە یەكێكیان نووسراوە (لە سەری بدە) لەوی دیكەش نووسراوە (ئازادی بكە) با بە خۆی بێت یەكێكیان رابكێشێت، كامەیانی دەرهێنا ئەوی لەگەڵ جێبەجێ دەكەم، راوێژكارەكەش دوو سێ قسەی كردن و كاغەزێكیانی راكێشا و پاشا نەیتوانی بیكوژێت دەبێ چی گوتبێت؟ (س.ئـ.٢٣٥)

١٢٣- سێ پێنج پانزدە، دوو حەفدە، سێ بیست.

١٢٤- مەڕی مەمی، مەم شوان، نۆ مەڕ، دە بێری، یازدە كسۆڵە دوانزە بەران هەموو چەندن؟ (س.ئـ.٢٤٢)

١٢٥- ئەم لای پەرژین، ئەو لای پەرژین، تیایەتی (ناوڕاستەكەی) كۆترێكی نەخشین. (س.ئـ.٦٠) (ئەردەڵانی)

١٢٦- مەلێ هات بە سی سی عیسا لە مووسای پرسی، ئەو مەلە بۆ رۆیی بە برسی؟ (س.ئـ.٩٢) (ن.سەقز)

١٢٧- باوكێك و دایكێك و كوڕێك چایان لە بەردەمدا بوو، پیاوەكە چایەكەی لە راستەوە بەرەو چەپ بە كەوچك ئەیشێواند، ژنەكە لە چەپەوە بۆ راست، منداڵەكەش بە شێوەی بازنە (دایرە) ئەیشێواند. بۆ چایەكانیان وا تێك ئەدا؟ (س.ئـ.٢٣٤)

١٢٨- تەنها سێ هێلكەیان بە سەر حەفسەد و دوو پیاودا دابەش كرد، هەموویان یەك هێلكەیان بەركەوت. (س.ئـ.٢٣٩)

١٢٩- هەپلەپان و هەپلەپان، گیایی شینە، پەلكی پان، كوڕی پیرە، با بێ جان؟ (س.ئـ.٥٢)

١٣٠- ئەم لای دیوار، ئەو لای دیوار، ناوەڕاستەكەی سەگێكی هار. (س.ئـ.٥٩)

١٣١- سێ كەس دەچن بۆ حەمام و دوای خۆشوردن دێنە دەرەوە. یەكەمی بە حەمامچی ئەڵێ: حەقی من چەندە، ئەویش ئەڵێ: كاكە گیان چەنێ پووڵ ها لە ناو دەخڵەكەما ئەوەندەی‌تر بخە سەری و چوار تمەن ببە بۆ خۆت دووهەم دێت ئێژێ من چ بكەم؟ دیسان حەمامچی ئەڵێ: یەكەمی چی كرد تۆیش وا بكە و بە سێهەمیش ئەڵێی: تۆیش وەك ئەوان بكە. بڵێ لە هەوەڵەوە چەنێ پووڵ لە ناو دەخڵەكەدا بوو؟ (ئەردەڵانی)

١٣٢- رۆژێك چوومە سەر گۆڕستان، دیم ژنێك دەگریێ و لە خۆ ئەدا بە كۆڵەمستان (كۆڵەمشت) گوتم بۆ دەگری وا كردووتە قورپێوان، گوتی برای ژنی ئەم مردووە خاڵمە ماڵوێران؟ (س.ئـ.١١٢)

١٣٣- خشتە كونێكە ٤٠ مەن بارییە، بۆ خۆی بێ گیانە، گیاندار سوارییە، گیاندار بەوەوە توانای غارییە،

گەر ئەوەی نەبێ دەردی کارییە؟

١٣٤- یەك پێ لە دەشتێ، دوو پێی گەیشتێ، خستییە سەر پشتی. (س.ئـ.١٧٦)

١٣٥- دەدە ناکەم، بەبە ناکەم، بە عیساکەم، بە مووساکەم، هەر دوو لنگی لە حەواکەم زێڕ و هۆڕی لێ پەیدا کەم. (س.ئـ.١٧٧)

١٣٦- بنی دەگڵی، قەدی دەکەرێ، سەری دەتوو، ئەگەر نەزانی چاوت دەرێ. (س.ئـ.١٨٩)

١٣٧- دووی لێ دەبێتە سێ، نزیکی لێ دوور دەکەوێتەوە، دووری لێ نزیك دەبێتەوە. ب) چواری لێ دەبێتە دوو، دووی لێ دەبێتەوە سێ، دووری لێ نزیك دەبێتەوە و نزیکی لێ دوور دەکەوێتەوە. (س.ئـ.١٣٨)

١٣٨- مەیلەکم هەیە مەیلانی لە ناو بوخچەی سوبحانی (سوڵتانی)، خودا نەبێ کەس نایزانی. (س.ئـ.٨٧)

١٣٩- کەوەڵاوکەوەڵ ناوێکیان هەیە، شەش پا و دوو سەرە، چاوێکیان هەیە. (س.ئـ.١٧٣)

١٤٠- چێوی ئامە، ئائی نەنە، سەری چەشمەش ئائو نەنە، چێشان چێشان مەوزووش پەنە. (هەورامی) (س.ئـ.١٨٢)

١٤١- چل کەس گەڕ و کەچەڵ و کوێر بە تێکەڵاوی چوونە گەرماوە (حەمام) خۆیان شوشت، چل دیناریان دایە خاوەن حەمامەکە، هەر گەڕێك دەبوو ٤ هەزار تمەن بدات و هەر کەچەڵێك ٢ هەزار تمەن و هەر کوێرێکیش چارەگە ١/٤، ئایا چەندیان گەڕ و چەندیان کەچەڵ و چەندیان کوێر بوون، بۆ ئەوەی چل کەس بە چل دینار خۆیان بشۆن؟ (س.ئـ.٢٢٩)

١٤٢- خاڵ بۆ ئەم پیتانەی خوارەوە دابنێ، بە مەرجێك مانای تەواو ببەخشێ! ـە سەر ـە سەر ـە سەر دەکا. (س.ئـ.٢٣٦)

١٤٣- مەتەڵێکم هەیە پێنج پیتە، لە ئارد دایە و بێ پیتە پاش و پێشی وەك یەکە ئەوی مەتەڵ هەڵبێنی، دیارە هونەر ئەنوێنی؟ (س.ئـ.٢٣٦)

١٤٤- دارێکم هەیە و شیە ترێی دەگرێ ئەوەی بە ناحەق بیخوا دەمرێ. (س.ئـ.١١٤)

١٤٥- قەڵای گۆشتینە و رەوانی (رۆحی) پیرۆزی لەبەردایە، بەرگێکی خوری لەبەردایە، لە ناو ئەشکەوتێکی گۆشتیدایە، ئەشکەوتەکەش لە ناو بەحردایە؟

١٤٦- باوکی دارە، دایکی دارە، منداڵەکەشیان نەبەردە. (س.ئـ.١٠٧)

-١٤٧

به پەنج فریشتەی شاخداری بێ رەنگ
ئاهووم بردە بان سارای سفید رەنگ

ئاهوو نە ئاهــــوو شاخ و پـــا داروو
سارا نە سارا سەنگ و خــار داروو

ئاهوو دوو شاخی هـــــا بە سەرەوە
هەر دووکیشی ها بە گــــەوهەرەوە

(ن.مەریوان) (م.ئـ. ٢٣١)

١٤٨- ٤٠ تمەنت پێ ئەدەم ٤٠ حەیوانم بۆ بکڕە. شێر دانەی ٤ تمەن، کەروێشك دانەی ٢ تمەن و ڕێوی چواری ١ تمەن. لە هەر کام لەمانە ئەشێ چەن سەر بکڕی؟ (ن.مەریوان)

١٤٩- ژنێك لە بەین ١٠ پیاودا دانیشتووە و پیاوێك لە ڕێگەوە دێت و بە ژنەکە ئەیژێ ئەم پیاوانە چی تۆن نامەحرەم نین؟ ژنەکە ئەیژێ نامەحرەم نین دانەیەکیان شوومە و سێیانیان هەیوەرمن و شەش تریان برامن، هەر ١٠ کەیشیان لە یەك دایکن، چۆن وا ئەبێ؟ (ن.مەریوان)

١٥٠- دوو پیاو یەکێ لە خۆرهەڵات و یەکێ لە خۆرنشین کە یەکتریان نەدیوە و هیچ ئاشنایەکیان نەبوو بە کچەکانیان ژن بە ژنیان کرد ئەم کچ خۆی دا بە ئەو و ئەو کچ خۆی دا بە ئەم. دوای ماوەیەك دوو کوڕیان ئەبێ ئێستا بێژە دوو کوڕەکە چی یەکن؟ (ن.مەریوان)

١٥١- چوار کاری سەرەکی ژمێردن لەسەر ٧ دانە ٤ بەڕێوە بە کە ببێتە ١٠٠. (ن.مەریوان)

١٥٢- ڕەوەکا تەیرا گۆتە ڕەوەکا تەیرێن دی: ئەگەر یێك ژ هنگۆ بێتە ناومە، ئەم دێ سێ جار هندی هنگۆ تێ هینین. ڕەوادی گۆتی: نەخێر! ئەگەر یێك ژ هنگۆ بیتە ناومە، ئەم دی هندی ئێك لێ هێین. ئایا ژمارا هەرەوەکێ چەند بوویە؟ (س.ئـ.٢٢٦)

١٥٣- دوو ڕەوە کۆتر لە تەنیشت یەکدی دەفڕین و لە یەکدییان دەپرسی ئەنگۆ چەند کۆترن ڕەوەی یەکەم گوتی: ئەگەر یەکێك لە ئەنگۆ بێتە ناوەمە ئەمە دەبینە هەندی نگۆ ڕەوەی دووهەمیش گوتیان: ئەگەر یەکێك لە نگۆ وەگەر ڕەوەی مەبکەوی ئەوا ئەمە دەبێتە دوو هەندی نگۆ ئایا ژمارەی کۆتری هەر ڕەوەیەك چەند بووە؟ (س.ئـ.٢٢٦)

-١٥٤

سەرافان وەویــــر، سەرافان وەویر
عەجو لوعبــەتی کەفتیـــیەوە ویر

نەرمەچی مایی ئێســـبیە چی شیر
وەروی تەن جیهاڵ قەڵب بــەددن پیر

مەردوم وزوی تەن مەپۆشێن بەرگی
ئەو بەرگ تەن پۆش ها وە تۆ جەرگی

ژە شەوق خەنەش شەفەق مەخیزۆ ژە لەوح دیدەش نسرین مەریزۆ
هەر کەس ئی مانا وەویر باوەروو سەیا قو و نەقش ئافەرین کەروو

(لەکی)

١٥٥- پیاوێ ژنێکی ماچ کرد وتیان: ئێوە چی یەکن؟ وتی: دایکی شووی ئەم ژنە لەگەڵ دایکی خێزانی منا دایك و خوشکن. (ن.مەریوان)

١٥٦- ئەڕوا ها بەسەر نەڕواو، نەڕوا ها بەسەر ئەڕواو. (ن.مەریوان)

١٥٧-

فەقێ هەشت و کەوچك نۆ یەکێکیان خنکان بە بێ دۆ

(ن.مەریوان)

١٥٨- باوکێك و کوڕێك تەسادف ئەکەن ئەیبەنە لای دوکتۆر، کابرا ئەڵێ کوڕی منە و تەسادفی کردووە، دوکتۆر کە ئەڵێ کوڕی منە هەردووکیشیان راست ئەکەن بڵێ چۆن؟ (ن.مەریوان)

١٥٩- ئەوە چییە لە سێ وەرزا نییە، ئەگەر مەلە بکا ئەبێ بە ئاو، ئەگەر گەرم ببێ ئەگری تا ئەمرێ ئەگەر سەرمای ببێ، زیندوو ئەبێتەوە. (ن.مەریوان)

١٦٠-

شاهۆڵەی پۆشاش بەرگ متقاڵی عەیلی بارش کەرد دەروەن بی خاڵی

(ن.پاوە)

١٦١-

بانگوێژ مۆئەزن وەك نەی خۆش ئاوازە بی سیخە و تەلاق بێ رۆچە و نمازە
حەلاڵ زادەی پاك حەرام پەروەردە زینا جە مادەر ئاشکرا کەردە

(ن.مەریوان)

١٦٢- دە و دە ناکاتە بیست لەگەڵ پەنجای دەکاتە یانزە. (س.ئـ. ٢٣٥)

١٦٣- ژوورێك پڕی کچ بوو، هەر پیاوێك بچوایتە ژوورەوە کچەکان دەیانکوشت بەڵام پیاوێك چووە ژوورەو گوتی من نۆ قسان دەکەم ئەوجا بمکوژن، کە قسەکانی کرد کچەکان نەیانکوشت و هاتە دەرەوە. پیاوەکە چی گوتووە بۆ ئەوەی کچەکان نەیکوژن؟ (س.ئـ. ٢٣٥)

١٦٤- **ئەلف)** گوڵێکم بینی پیتی هەڵگەڕابوو، سەری کافەکە و لامی نەمابوو پیتی دال و ڕای بۆ دانرابوو.

(هـ.٤٥) ب) گوڵێکم دی زەردی هێنابوو سەری کافەکە و لامی نەمابوو پیتی دال و ڕێی بۆ خۆی دانابوو.
(ئەردەڵانی) ج) گوڵێکم دی زەردیی هێناگە، سەری کافە و لامی نەماگە حەرفی دال و ڕێ بۆ خۆی دایناگە.
(ئەردەڵانی) د) من گوڵێکم دی کز، مل سووڕاو، کافەکە و لامی نەمابوو، پیتی ڕێ و دێی بۆ خۆی دانابوو. (ن.سەقز)

-١٦٥

شاری دڵنشین خۆش ئاو و هـــەوا     شـەسی لێ بەلا خۆی ئەبێتە لا

(ئەردەڵانی)

-١٦٦

ئەوە کام پیتە لەوێنــــەی چنار     لای عەجەم یەکە لای عەرەب هەزار

(ئەردەڵانی)

-١٦٧

ئەوە کام مەلە ها لە سەحراوە     ناوی بە ئەبجـــەد هەژدەی تەواوە

(ئەردەڵانی)

١٦٨- کام شوێن لەسەر عەرز یەکڕا خۆری لێ نیشت؟ (ن.مەریوان)

١٦٩- تا نەکەوێ دانامەرزێ! (هـ.١٦)

١٧٠- شەرعییە وەلێ خوا خۆشی لێ نایەت. (ن.سەقز)

١٧١- هەر جێگایەك گای سووری لێ بنوێ، گیای لێ شین نابێ؟ (س.ئـ.١٢٦)

## مەتەڵ لە شیعری شاعیراندا

هێندێ لە شاعیران جگە لە بابەتەکانی دڵداری، کۆمەڵایەتی، نیشتمانی و... بە زۆر لایەنیتردا هەنگاویان هەڵگرتووە. وەکوو پەندی پێشینیان، قسەی نەستەق، داستان، گاڵتە و گەپ، مەتەڵ، چیرۆك و ئەفسانەی کۆنی ناو کوردەواری. ئەو قسە قوت و نەستەقانەی کە لە دەمی خەڵکەوە بیستوویانە بە شێوەیەکی دڵگیر بە پەخشان یان شیعر نووسیویانە و لە مەترسی بیرچوونەوە و تیاچوون رزگاریان کردووە. هەندێ لەو شاعیرانە بریتین لە: پیرەمێرد، عەبدوڵڵا گۆران، هەژار، حافزی مەهابادی، سەی یاقوی مایدەشتی، ئیبراهیم ئەفخەمی و... لە نێو ئەمانەدا گۆران و پیرەمێرد و ئەفخەمی بۆ زاخاوی مێشك و هۆشیارکردنەوەی خەڵك بایەخێکی زۆرتریان بە مەتەڵ داوە و مەتەڵەشیعریان لە رۆژنامەکانی سەردەمی خۆیاندا بڵاو کردوەتەوە و خەڵك خۆیان بە هەڵهێنانی ئەو مەتەڵانەوە خەریك کردووە. لێرەدا نموونەی چەند مەتەڵێکی ئەو شاعیرانە وەك چەپکە گوڵی رەنگاورەنگ ئەدەم لە سینگی مەتەڵەکانم.

ئیبراهیم ئەفخەمی:*

١-

ئەوە چییە دەخزێ و ناخزێ          هەڵمەت دەبا وەکوو دزێ

(مەشکە)

٢-

ئەوندووکە بـــە دەندووکە          لە نێو میران دەڵێی بووکە

(چرا)

٣-

ئەم لای کەڵەك ئەو لای کەڵەك          لە نیوەڕاست چەرخ و فەلەك

(زبان)

٤-

باخێك چوار دەوری پەرژینە          تێدا دوو کۆتری نەخشینە

(چاو)

٥-

بە سەر پیرەژن بە چنگ مناڵە          بە پشتی روستەم نەتەوەی زاڵە

(شۆڤار – سیخوڕ)

٦-

بنی بییە سەری شـــاخە          ناوی ئاسن پڕ لە زاخە

(خنجەر)

* ئیبراهیم ئەفخەمی لە کتێبی «ئەوە چییە؟» گێڕاوە.

-٧

بەری هەسانە پشتیشی خوری          ساهەڵی بێنەکێ بۆ تۆی دووری

(قاچك)

-٨

بە شەو دەڕوا نارنارۆکە          بە ڕۆژ دەڕوا باربارۆکە

نە هێلکە دەکا نە بارۆکە

(چۆم)

-٩

بۆ خۆی بێ گیانە دەگەڕێ لە گیاندار          ێ گیانی بکا و ڕەقی کا وەك دار

(تفەنگ)

-١٠

تا سەری نەبڕی نایەتە گوفتار          تا خوێنی نەڕژی نایەتە وتار

(قەڵەم)

-١١

چوار باڵ و سەری دایم بە دواوە          جزو جەواشـــیر مەکانی ئاوە

(ماسی)

-١٢

کوڕی خاکم زۆر بە ناوم          نزیك ئـاور برای ئاوم

(چایی)

-١٣

گـەرمیشە و نـــەرمیشە　　دۆخێنەکەی بکەوە تێ نیشە

(دۆڵمە – یاپراخ)

-١٤

لە دوور دێ لــە دوور دێ　　قەڵەم و قاقەزی سوور دێ

(هەورەبرووسکە)

-١٥

لە شامی کەنین لــە شیراز ئامان　　بە خونەی شەونم بەهار دەر ئامان

(کارگ – قارچ)

-١٦

مریشکێکم هەیە زەنگی زەنگی　　هێلـکە دەکـــا پڕ بە چنگی

(مەشکە)

-١٧

مەلێکم هەیە مەلە ســـاتۆرە　　قاچ و قول باریـــك بن باڵی بۆرە

شاخی لە بان سەرچاوی کلوورە　　بە برێشکەی دەخۆن کڕیاری زۆرە

(کوللەیە)

-١٨

نۆ مانگ لە زەوی سێ مانگیش لە دەر　　هەوەڵ بۆ ئادەم دووەمین بۆ کەر

(کەنگر)

-١٩

هەر ساڵێ ساڵێ هەر دەورێ دەورێ    دوو ئاو لە جامێك هەر یەك بە جۆرێ

**(هێلكە)**

-٢٠

هەتا نەیبەستی ئەو بستی ناڕوا    رزگارت دەكـا لە بەفر و ئاوا

**(كەڵەی چەرم، كەوش)**

**ماموستا هەژار:**

دە بزانە چییە؟ خـــــۆشە مەتەڵم — بیری لێ بکەوە مـــــەڵێ تەمەڵم

گیانلەبەرێکە مەلـــــەوانی گۆم — زۆر جاران دیوتە لە رووبـــار و چۆم

بێ قاچ و دەستە، بێ چرپە و هەستە — لە شەپۆل برین وەکـــــوو مقەستە

باڵیــــــشی هەیە و پێیـــان نافڕێ — زاریشی هـــەیە و هـــەرگیز ناقرێ

نیوەی لە ناوی دەی لـــە چل کـەمە — ماسی بۆ بنووسە و بیخۆ سێ ژەمە

ئەگەر پێت نەکرا هێـشتا بیـــناسی — دەتخەمە ناو ئاو دەتــکەم بە ماسی

**(ماسی)**

**سەرچاوە: (هەژار بۆ کوردستان/ ٢٢١)**

## سيديعقوب ماهيدشتي:

### معما براى رحيم خان سروناوى

دريـــــا عمـــــــانى غواص بحرين دريـــــاى عمانى
يـك رۆژ جـــه گردش زمانه فانى تجربەم گـــــرتن پێ نكتـەدانى
ناگـاه چاوم كفت و دو تيـــپ سوار تيــپى فـــــرنگى تيپى زنگەوار
نـەمـا نيشان دو تــــن ريش سفيد سرتاپا عريان بى مــــاوا و بى زيد
يك قطـــعه زمين دعـــوا كرده بين آبـــــه زيادى بـــــرآورده بين
لاشەشان چون پوست پلنگ گل گل بى رنگ گل نه طهر ديـــــده بلبل بى
دو صـــــف سوار يســـار و يمين هانه خصــــومت پى قطعه زمين
چون مرغ بســـمل ويشان لش مكرد اوان فتوا ميان ايــــان بش مكرد
هــــر كسى رخنه وى معـــنا بردن گويا (سەى ياقـــو) زرخريد كردن

### جواب رحيم خان به معما:

سيـــــد و خيـــالْ به بەلى فكره كــــردى و خيال
غــواص بحرين دردانـه و لال صراف سخن خويرده ماوى خال
معـلومه حرفت خوش مجازيه تاس و تخته نرد نـــبرد و بازيه
و مجلساندا خانـــان منـشيان طوطي وار مكن لـولو درفشان
و بازى نردا هركسى شـش در ببندد و كس موو صاحـــب سر

سەرچاوە: (ديوان سەيد ياقو ماهيدەشتى/ ل٣٤ و ٣٥)

### معما از سيد ياقو:

پنج ملا هنن بيدســـــت و قلم و صب تا ايـــوار منيش وهم
او پنجه آهن، اى پنجه و سنبل مكيشن ديـوار بى آو و بى گل

سەرچاوە: (ديوان سەيد ياقو/ ل٣٥)

**جواب رحیم خان:**

پنج ملات پنج سیخ آهن بـــدنن فکـــــــــر رویه رفـــتار زنن

او سیخ جوراب دنیاش وکـــامن اویش هامنشت حوری حور فامن

**١- هدایت خدادوستی**

گاوگمان هنن تاریك شو رنگ دایم ها لەبان قلعەی گلی سنگ

فره یا کمی پنجـــای با ریه ده نفر تـــمام خدمت کــــاریه

تا پشت اوگـــامالی له گل

اوگا او باره نیوەید و منزل

**٢- جواب عبدالله مرادی «دلریش»**

او گاله آهـــن ساختـــه آهنگر ساخته پری رفع مشـــکل بشر

مەنەنی لەبان سەسنگ لەکوەانی پنجای یا بیشتر خیور نەنـــەبانی

نازاران وەناز و هـــــر ده انگشت دەنی وه دستا پهنی کن له پشت

افکار دلریش لی هـــاج واجەن

بی شك استادم معمات ساجەن

سەرچاوە: (عەبدوڵڵا مورادی، دیوان دڵڕیش ماهیدەشتی/ ل٢٠٩)

**٣- معمای عبدالله مرادی «دلریش»**

یی مەلی هنن صداش چون خەرەن له رفت و رەوش چون جنس پرەرەن

سینەی چـــــون سینەی عین آیه چەوی عـــــــدسه دەمی پایەمه

هرکـــس نام یەکوو بـــاورو

دلریش سرلەلی سجو ماورو

### ٤- جواب میرزا هدایت خدادوستی

اوه مەل نیه نیه ممانـــــو وەمـل    پروردوی زیقاو سرله ریشەی زل
له پرش چون مل بی‌بـــال و پره    عـــاشق وه آوه همیشه تره
چیو خر صدایه چون مـــل هل پره    همیشه و دایم ها له نـاو خره
دمی چون پایەم سینەی صاف و سر    عجوزه دیو گول سخت دریا بر
نه خر نه ملـــه جوانی زاقه
استاد معمات بی‌شلك قورواقه

سەرچاوە: (عەبدوڵلا موورادی، دیوان دڵڕیش ماهیدەشتی/ ل٢١٦)

### ٥- معمای میرزا هدایت خدادوستی

اجازه بدر فکـــــرم بکم جم    معمای بنویسم پی اسـتاد خوەم
چیشتی بنویسم وه دل وو گـیان    پری عبدالله شـــعرای سخن‌دان
وو شاگرد ویت بکر حـــساوم    و لفـــظ شیرین بـــدر جواوم
استادان خاص ای کـاره کردن    چند ستون دیری هرچن هام فردن
گاەگاه خوابیده گاەگاه بـیدارن    گاەگاه هام مونس خـاطر نازاران
گاەگاه گول شکوف باغ بهاران    له بعضي موقع دل لیـش بیزارن
پنج و دو و سه خدمتکارشن
همیشه و دایـم له فرمانشن

### ٦- جواب عبدالله مرادی «دلریش»

بەبە له فکره میـــرزا هدایت    بلند اقبال بید پادار بود پـایەت
در و دانه و لعل کردیه عـنایت    ایمەی فیض مەویم له چتر سایەت
خوب فکری کردن استادان خاص    ستون له آهن برگ سـیای پلاس
ستونان له ژیر وصلەن وه پارچه    له خوارەو گوچانه له بان و قارچه
له وقت واران فصـــل بهاران    نەنی بان سر خاطر نـــازاران

زمستان و بهار بـــازارش رواج ... جاش فوق سرەن وینەی لـعل تاج

استاد و بطور وله ازل کـــاشتن ... چون خیمەی خسرو له سـرافراشتن

خیمەش برپاکن بی‌ستون و میخ ... خـــــریدارشن فصــل و فـرو یخ

برف چینی باران هــر دو بارشن ... انگشان هـــــرده خدمت‌کارشن

فصل تابستان بی‌وارانی و خوەر ... له لیـــــش بیزارن لاوەنی له سر

تابستان بی رونق بازار کســادن ... سپهـــــرواران زبــــون و بەن

چون تاج شاهان برگشته اقبــال ... تاوسان جمع میو ها له کنج مال

مالی خراب بوستونی خـــم کن ... گوشەنشین بو اسبابی جمـــع کن

دلیرش گواهن شعرت پرعطرەن

استادم جواب معـــمات چترەن

**سەرچاوە: (عەبدوڵلا دڵڕیش، دیوان دڵڕیش ماهیدەشتی/ ل٢١٧)**

## پیرەمێرد:

لەم قەراغ شارە وەرە بنوارە    کوێت لێ دیارە، مەڵبەندی یارە

لە دوور دوور نیگای شیرین و بەرزە    نزیك کەوتیەوە ئەتخاتە لەرزە

ناوی گوێزێکە خانەی نێچیرە    باسەفا و پڕغەم سەیرانگای زویرە

هەر هەفتەی رۆژێك کۆگای ژنانە    (ئۆپیرا)ی ژنان، گۆرانی خانە

بە شەو پیاوخۆرە رۆژ ئاوی چاوە    ریشەی درەختی جەرگ و هەناوە

کێ هەڵیبێنێ ئێوارەی جومعە    حەڵوای ئەددەمێ بیکات بە لوقمە

**(سەرقەبرانە)**

**سەرچاوە: (دیوانی پیرەمێرد/ ل٤٢١)**

ئەم مەتەڵەیان نەختێك گرانە    لە قینی ئەوەی وتیان ئاسانە

زبان زەدێکی کوردە پەتیە    لە جێی پاساری ئەم پێنج پیتیە

هەرچی ئەنووسین کوردی پەتیە    با پێمان بڵێن پەتی و پەتیە

یەکەم و دووهەم لەلەی ژمارە    لە خوار پێپیلکە سەدا بنوارە

وەریگێڕیەوە پارچەیی لەشتە    کە ئەوەت لێ بڕا، گریان بەشتە

سێهەم بخەرە ناو دوو و یەکەوە    بۆ جل و راخەر نەنگە پێکەوە

کە سەری نەبێ کونی تێدەبێ    ریسی جۆلایی پێ جێبەجێ ئەبێ

یەك و سێ بلێ عەزیز بەو ولاخ    کاتێکت زانی چوو بۆ ئابلاخ

یەك و دوو و پێنجی جەرگەی زستانە    لەگەڵ پەیدا بوو چلەی بەندانە

دوو خاڵی نەبێت ئنجا دەعبایە    پیاوخۆری شەتی خواری بەغدایە

کێ هەڵیبێنێ ئەمجارە بە خوا    وێنەی شیرینی سجووقێك ئەخوا

**(چلوورە)**

**سەرچاوە: (دیوانی پیرەمێرد/ ل٤٢٢)**

| سیٚ بەردە و بــــەرد نییە | بن رەقە و بۆ تەور نییە |
| --- | --- |
| گیاخۆریشە و کــەر نییە | هێلکەکەرە و مر نیــیە |

**(کیسەڵ)**

**سەرچاوە: (دیوانی پیرەمێرد/ ل٤٢٣)**

| زیندوو هات بە فیێڵ مردوویەکی ناشت | بەری دارەکەی ئادەمی لیٚ ناشـت |
| --- | --- |
| زیندوو بۆ خواردن هاتە سەر مــــردوو | مردوو هەڵبەزی، زیندوو پێوە بوو |

**(تەڵەی مشك)**

**سەرچاوە: (دیوانی پیرەمێرد/ ل٤٢٣)**

**مامۆستا گۆران:**

ژوورێکی زل وەك مزگەوت ... ئەچنە ناوی شەش و حەوت

کۆڵانی تەنـــــگ ئەبڕن ... تا جێی خۆیان ئـــەگرن...

جێی دانیـــــشتنی گیاندار ... تاریـــکەو نەخشی دیوار

ئەژی لەبـــــەر رووناکی ... ئای خوایە چـــەن بێباکی!

**(سینەما)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٥)**

ئەوەندەی چنگێ لۆکـــەی نەرم و شل ... بە ناو ئاسمانی شیـــــنا ئەدا خول

مووروولەی چاوی پڕ لە نیـگای نەرم ... ئەگێڕێ بۆ جێی هێلانەیەك گـەرم!

بۆ جێیەك ئارام، ئاســـایش، شادی، ... سێبەر بن تیایا بۆ سەر ئـــازادی!

لەوێ بە دوو پێی سووری وەك شیلان ... سەوزایی چیمەن بشێلێ جوان جـوان

ئاقیقی دەنـــووك بەرێ بۆ چـــینە: ... بێ ترس، بێ دوشمن، بێ رق و کینە!

ئەم مەلە جوانـــەی لە شەڕ بێزارە ... هەرکەس بیناسێ زیرەکە، دیـــارە!

**(کۆتری ئاشتی)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٦)**

بیستم سنووقی تــــەختە ... ئەیوت: سیحر ئەمـــەتە!

رێم بدەو گوێم بۆ شـــل کە، ... «بەح» لە دەنگی بلبل کە!

بە هەزار دەنـــگ و زمان ... ئەڵێم، ئەخوێنم جوان جوان!

**(رادیۆ)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٦)**

پیرۆزە، نیازگـــــای ورد و درشتە
نیایا بە کام ئەگات پەری و فریشتە
چاوی دایك و باوك و نەنك و باپیـران
لە دەرگای چەقیوە، سەرپاکی ژیران
هیوایان وەهایە کـــــە لەو دەروازە
دەرئەچێ بەیداخی ژیــــانی تازە
ئەو کۆشکە هەڵبێنن ئەی لاوی وڵات
لە پەنای سێبەریا ئەگـــەنە ئاوات

**(قوتابخانە)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٧)**

تیـــــغی تیژی بە بـــــڕشتە
حوکمی سەری تۆی بە مشتە
لە بەرچاوت بە هـــــەزاران
زەرد و رەش و سپیی ئینسان
ئەداتە بـــــەر داسی درەو
تاوێ بە رۆژ، تاوێ بــە شەو!
سزای پاکۆی ئەم گشت لـەشە:
لە کیسەی خۆت پارەی بەشە

**(سەرتاش)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٨)**

سێ پیتە مەتەڵی ئەم چارەی ژیــــنت
بیزانی ژین ئەکـــــا زۆر ئافــەرینت
یەکەمیان وەکوو مێرد لایەکە لــە ژن
دووەمیان لە (جێ)دا ئەکشێ بـەرەو بن
سێیەمیان بەرەو دوای قووتی ئینسانە
بێ هەر سێ ئەم کۆشکەی لەشمان وێرانە

**(ژین)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٨)**

مەیکێشە با کەم نـــــەکا
زۆرە لـــــــە ناوی یەکا
جووتی پاڵکەوتووی ناو تاق
بیست دانـــەیە لە عێراق

**(جگەرەی پاکەتی)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران)**

حەوتە مەتەڵم ژمـــــــارەی پیتی، مژینی مانگای خـــــەڵقە نەریتی،

پیتی سێ و پێنجی لەگــــەڵ شەشەمی بۆتە هۆ لێمان داپچـــــــڕێ دەمی

حەوت و شەش و دوو لــــەگەڵ سێ بەرێز شتێك نین چووبی بە لایـــا هەرگیز!

زیاندارە وەك پێنج و شــــەش و حەوت دەرپالــــــووشێکە بۆ چاڵاوی نەوت

گوێچکەی تاقکەوتووی وەك هیی کەر درێژ، کلکی کـــوتومت مارێکی ژاررێژ

چییە ئەم دەعبا دڕنـــــــدە و پیسە؟ پێنج بوایە پیتی ئەتــــوت ئیبلیسە!

**(استعمار بە ئیملای عەرەبی)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران)**

وشەی مەتەڵ پێنجە پیـــتی هەڵبێنی زرنـــگ و زیتی!

لە یەك و دووی لەسـەر دوانی لە سێ تا پێنج تۆ بی، جوانی!

بێ دوو، وشە، شای چێشتانە، بێ سێ گەورەی نـــاو خێزانە

باتا واتا مـــــەتەڵزان بە خاوەندی قـــۆندەرەی جوان بە

**(پێڵاو)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٨)**

لە (هەمان ژوور)دا بۆ دوا وەرگەڕام کە گەیشتمە بەر «ژین»یان پیشاندام

سرنجم ورد دا لــە پیتی هەشـــتەم دیم دەنگی لای کورد دەرناچێ لە دەم

بۆ کـــــــردنەوەی تەلیسمی مەتەڵ حەوت بەسە، هەشتت با نەبێ لەگـەڵ

**(ژین)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥١٨)**

دیم لە گۆیەکی زەردی ســــــوورباوا دە پانزە ژووری هێلـــــــکە لە ناوا

لە ژووری سێ سووچ دەریای شەربەتاو لە هێلکەی وەك زیخ بووبوو بە گۆماو

دەریالووش بە کێرد ورگی گـۆی دڕی
ژوور ژوور شـــەکراوی لە دەریا بڕی

هێلکەی فڕێ دا و گۆی پان کـردەوە
گۆی هونەری خـــۆی ئاوا بردەوە

**(پرتەقاڵ)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣١)**

مەتەڵەکـــــەمان چوار پیتی ساغـە:
دروست کـــــــراوە لەسەر بناغە

لە یەك تاکوو سێ ئـــــــاوریشم دڕە
باخۆ شـــوێنێکی لــــە ولاغ پڕە

یەك و دووان و چـــــوار زولفی نازدارە
یەك و چوار خــراپ هەر شەرمەزارە

هەیەتی گشت شت سێیان و دووان و چوار
بیزانەو بلێم بژیـــــــت هەزار جار!

**(خانوو)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣١)**

شارێکی گەورە هاونـــاوی گۆمە
سەر سنوور کەوتووی عەجەم و رۆمە

سێ پیتەی وشەی لە پێوە بۆ سەر
چیت بوێ لە دەم پێی دێنـــیتە دەر

ناونجیی لاخەی پیتی یـەك و دوو
لێت نادیارە وەك نـــــاوی مردوو

بەڵام چەواشە بڕوانی بـــــۆیان
ژمارەی مانگن بـــۆ ژنی دووگیان

**(وان)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٢)**

مەتەڵ حەوت پیتە (نووســین بە کوردی)
گـــــەر هەڵیبێنی ئەڵێــــم زۆر وردی

پیتی یەکەم و دووەم لەگـــــــەڵ سێ
بەو سەرەوانێ ئەم ســــــەر ئەبەستێ

پیتی سێ و شەشی لەگەڵ یـــــەکەم بێت
لای بابی لووتکەی (کـــاژاو) ئەکێڵێت

بەڵام حەوت و دوو شەش و یەك هەر چـوار
زێڕێکە لیمان ئـــــــەدزێ ئیستیعمار

**(تەلەفون)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٢)**

مەتەڵی ئەمجارە لە نۆ پیت پێکهات: / مایەی پێشکەوتنە بۆ گەل و وڵات
سێیەم و چوارەمی، یەکەمیش لەسەر / لە هیچ کوێ نابینرێ لە خانوو بەدەر
یەکەم و دووەم و شەشەم بە ریزە / میوەیەك پێك دێنن میوەی پاییزە
پیتی پێنج و حەوت و هەشت و نۆ ئاسان / ئەبێ بە شارێکی سنووری ئێران

**(قوتابخانە)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٢)**

ناپاکێکی پێنج پیتی‌یە / زیانداری نەریتی‌یە
سییان و دوو یەك وەك رووی رەشە / بە برژاندن ئێجگار چەشە
لەگەڵ دەرکەوت (چوار، پێنج) ئەڵێن / لە یەکتر و بەو ئەدەن جوێن
بەو کێردەی خۆی دای سێ و دوو چوار / ورگی ئەدڕن وەك گورگی هار
لە (یەك، دوو، چوار) هەڵێنە دروون / ئەڵێن تۆپی شێری مەلعوون

**(جاسووس)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٣)**

پێنجە ژمارەی پیتگەلی مەتەڵ / بێ سێ شیرەکەی ئەکەنە مەنجەڵ
یەك و دوو خڕە و یەك و دووان و سێ / بە شیش ئەبرژێ و ئەیخوا گشت کەسێ
لە دوو هەتا پێنج پشووی پاش کارە / سێ و چوار لەگەڵ دوو ئەبینێ دیارە!
ئەوەندە سووك و ئاسانە مەتەڵ / یاریی پێ ئەکا شوانی لای ئاژەڵ

**(گۆچان)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٤)**

مەتەڵەکەم چڵ پێی هەیە / هەر پێیەکی یەك رێی هەیە
رێگای باریك ئەگرێ و ئەڕوا / هەتا لەوپەڕ سەر هەڵئەدا
ناو رێگا هێند بۆنی خۆشە / تیغی سەرتاش بۆی پەرۆشە
زیرەك بەو بزانە چییە / ئەم مەتەڵە چوار پیتی‌یە؟

**(شانە)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٤)**

مەتەڵەکەم پیـــتی چوارە
بێ قاچە و کـلك و پەڕ دارە
ئەڕوا بێ پێ، ئەخوا بێ دان
هەوا بمژێ گـورج ئەدا گیان
بۆ هەژاری گوێ ئاو گۆشتە
پارەی باشی پێ ئەدا پـۆشتە
گەر بتەوێ مەتەڵ راو کـەی
ئەبێ خۆت نوقمی قوڕاو کەی

(ماسی)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٥)

مەتـــــەڵم پێنج پیتی رێکـە
خۆش ویستراوی گشت کەسێکە
پیتی سییان و چـــوار و دووانی
وەك سەدەف وایـــە ئێسقانی
بەڵام دووانی و چواری و پێنجەم
لە چوار پەلی ئـــەسپم ئەدەم
یەکـــــەم پیت و دووەم پیتی
هـــــەر لە بـــــوێژە بریتی

(منداڵ)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٥)

مەتەڵی حەوت پیت شـــــاعیری مەزن
بلبلی کورد بوو بـــۆ شیرین خوێندن
ئاوازەی چەشنی هیی یەك دوو، چوار بوو
مەعنای رەنگینی ورد وەك یەك و دوو
یەك و دوو چـــوار و پێنجـیشی لەسەر
پیشەی بوو لەسەر رووی دەریای هونەر
بە شیلەی جووڵەی چوار و حەوت و شەش
بە کوردزمانان شـــــەکری ئەدا بەش
بــــدۆزێتەوە کێـــیە مـەتـــــەڵم
ئەڵێی هـــــەر بژی یـــــاری لەگەڵم

(مەولەوی)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٥)

مەتەڵ شەش پیـــتی کوردی و ئاســــانە
حـــــەقیکە لەسەر خـــوێندەوارانە
سێ یـــــەك و دووان و پێنـــجەم و شەشەم
بـــــۆ (ژین) ئەبێتە نرخی هەفتانە
چنـــۆك رائەکا بۆ سێ، دوو، پێنـــج، شەش
پێی بلێم هیی ســــــاڵ بکە رەوانە

بلێم هیی شەش مانگە ئەڵێ: سێ، پێنج، چوار
ئەگــــــەر بۆ پارە هـەڵکوتمە ســــەرت،
با بێتە خـــەوت نیـــوەی ساڵانە
ئـــەبینی مەتـــــەڵ لەسەر زمانە!

(ئابوونە)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٦)

حـــەوت پیتە مەتــــــەڵ شاخ لێ رواوە
لە یەك تاکوو پێنـــــج بێ چوار ئەپرێسن
پێنج و شــــــەش و سێ بۆ چێشتی هەژار
ئەگەر حەوت و شەش لەگەڵ سێ و چوار بێ
پەنجە گـــــەزیوە و فرمێسك بە چاوە
ئەیکەن بە بــــــەرەو بەرماڵ پیرێژن
لە رەش، لــــــە سپی دێتە ناو بازاڕ
رەنگە بۆ نــــاوی مەتەڵ لەبار بێ!

(پەشیمان)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٦)

یەکەم شاعیــــرمان هـــەر بە ناو بیستراو
یەك و پێنج داری گــەورەی شــــیرین بەر
یەکەم و حەوتـــەم لەگەڵ شــــەش و دوو
زۆردار خستووینیە گێرە و کـــــەشمەکەش
ئـــــەگەر شاعـیری دێـــرینی گەلت
حــــــەوت پیتی کوردی بۆی ئەبێ بە ناو
لە یەك هەتا چـــــوار تابووت دێتە دەر
گشت کەس هیی چــــەوری ئەکا ئارەزوو
لەشی رووت کردووین لە یەك پێنج و شەش
نـــــاسی، هــــەر بژی قەڵەم و پەلت

(عەلی ترموکی)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٨)

هۆی حەسانەوەی ســـەرە
بەڵام کەر هەر لــــە ژێرە
ئەو نەبێ کــورد بییەوێ
زیرەکی خـــۆت بنوێنە
لەگەڵ سەر ســــوار و کەرە
هێنــــــدە بێ خێر و بێرە
هەم ژێر، هەم سەر ئەکەوێ
ئەم مەتـــــــەڵە هەڵبێنە

(سەرین)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٢٨)

چوار پیت وەك یەك تاق و جووت
قەڵای بـــــاو باپیری زووت
دەورەیـــــان دا کـــــــڵاوسوور
قـــــــەڵایان کردیت خاپوور
ئـــــــەم مـــــــەتەڵە بزانی
وەستای بەیـــــت و داستانی

**(قەڵای دمدم)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣١)**

پەنجە بەرە بـــــــەی هەڵگرە
لە خانـــــوودا روو لە دەرە
ئەوەی ئەیـــکا بە رەنجی شان
هاودووکانی ئـــــاسنگەرە
ئەگەر زانیت مـــــەتەڵ چییە
(نامەخوا)کەت لەسەر سەرە

**(پەنجەرە)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٢)**

مەتەڵێکە سەر لێ تێکدەر
کێواوکێو دەشت ئەداتە بەر
دوو جار بێت و ناوی بەری
باوکی مناڵ هەڵئـــەدا سەر

**(با)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٢)**

مەتەڵ بۆ کوردێك بە شەش پیت پێك دێ
چوار و پێنج و یـــــەك بەهار زۆر ئەبێ
چوار و دووان و شـەش بکێڵە بەهـــــــار
پاییز مێوژت ئـــــەبێ شەش پێنج چوار
لە سەرتە یەك و دووان و شـەش و چـــوار
گشت سێ و دوو و چوار و شەشێکی بەهار

**(نەورۆز)**

**سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٤)**

وەرە دروست کەین لە نۆ پیت مەتەڵ
داخ بەرینە سك خـــوای شەڕی چەپەڵ
ئەگەر لەباتی پیتی پێـــــنج و چوار
واوێك وەربگری لە کـــــۆتری نازدار

ئەمجا پیتەکان پاش و پێشتر خەی
دوایی بە وردی لە گشت سەرنج دەی
ئەبێتە بەهەشت، بەهەشتی نیاز
چۆلەکەی بۆتە مەلی (خۆش ئاواز)

(ئاشتیخوان)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٤)

حەوت پیتە ئەمجارە، نەگریسە مەتەڵم
لە دەستی زۆری چەشت ڕۆژی خۆی کۆمەڵم
لە یەکەم تا شەشەم خشۆکی ژاردارە
حەوت و شەش لەگەڵ دوو کراسی ڕەشمارە
حەوت و چوار لەگەڵ دوو بڵندە و، سییان و چوار
دەستەیە و، یەک، شەش، پێنج هاوارە لە ئازار
هەرکەسێ تینوێتی بۆ نەورۆز بنوێنێ
بێ گومان هەوڵ ئەدا مەتەڵم هەڵبێنێ

(ئەژدەهاک)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٤)

مەتەڵم پیتی حەوتە و ئاسانە
گەشە و بۆنخۆشە و بە ڕەنگ زۆر جوانە
یەک و دووان و سێ سەرجەمی زۆری
پێنج و شەش و حەوت مەڵبەندی زۆری
یەک و چوار و دوو لەگەڵ سێیەمین
ئەدرێ بە شانا چەرمێکە پەشمین
حەوت و شەش و سێ لەسەر کوڵمی ئاڵ
وەک داخی پەڕەی گوڵ دێتە خەیاڵ
بزانی چییە مەتەڵی بەهار
با ئافەرینت بکەن هەزار جار

(گوڵەباخ)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٥)

مەتەڵەکەم شەش پیتییە
ئاواتەخوازی برسییە
بەڵام زیخی وەک یەک و سێ
یەک، دوو، چوار، پێنجیش ئەیناسێ
وەک بەردی یەک، شەش، سێ ڕەقە
دار لە ترسی گازی لەقە
بەڵام ڕەق بێ یان ئاسان بێ
زوو بۆت هەڵدێ مەبەست نان بێ

(کولێرە)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٥)

لە شەش پیتەکەی جووتی پێش و پاش
قسەی منالْن بۆ شت جوان بێ و باش
لە سێوە بۆ پێنج کزی و بێدەنگی
یەك تا سێ زستان مایەی دلْتەنگی
هەرکەس لە یەکەم تا چواری زۆر بێ
دەزگا و دووکانی یاخوا هەر مۆر بێ
تا ئێستا نرخی ئێجگار گرانە
تاوانیش دیارە هیی شارەوانە
بزانی مەتەڵ سەوزەی رووسوورە
ئەڵێی لە وزەی کڕین ئای دوورە!

(تەماتە)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٧)

مەتەڵ لە چوار پیت پێك دێ
دووکەڵ ئەکا و ئەسووتێ
یەك دووی شیرین وەك هەنگوین
یەك دوو چوار مایەی پژمین
بۆمان ئەبووە هۆی سامان
سەربەست بوایە بازاڕمان
هونەری خۆت بنوێنە
ئەم مەتەڵەش هەڵبێنە

(تووتن)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٧)

مەتەڵی حەوت پیت زەنگیی کلاوسەوز
ئاو ناخوا بەرپێی تا نەکەن بە حەوز
مل هەڵواسراوی بن لقی بەرزە
پاش ئیعدام پێنج، چوار، سێ و حەوتی فەرزە
یەك دووی تۆز ئەکا، یەك، دوو، چوار لای ژوور
چوار و پێنج، سێ و یەك سەرۆکێکی دوور
ئەمیش هەر بەری رەنجی جووتیارە
کێ ئەیکا و کێیتر بۆی ئەخوا؟ دیارە!

(باینجان)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٧)

حەوت پیتییە مەتەڵی خۆش
چەرخ و فەلەك دێنێتە جۆش
لە یەك تا چوار رۆژی شادی
سەك تێری و گەردن ئازادی
لە سێ تا حەوت بابەتی ژن
سێ و چوار نیوەی کۆمەڵی من

لە چوار تا شـــــەش زادی خـوایە چوار، پێنج هەروەك شەش، حەوت وایە

سێ و پێنج و شەش هـــۆی هاوارە ســـەرنج بدەی مـــــەتەڵ دیارە

(جەژنانە)

سەرچاوە: (دیوانی گۆران/ ل٥٣٨)

سەر وە بان عەین عەینم خـــەم وەردەن هوون چون چەشمە نە عـــەین سەرکەردەن

یەند دەرد و ئاهم عەین کەردەن بێ نوور وەختەن هەشت کەم بۆنە پەنجەی مەشهوور

(ئەلف: عەین (یەکەم) خۆی – نەفس – عەین (دووهەم): ئەژنۆ – عەین (سێهەم) ئاو. عەینی (چوارەم) چاو. واتە: سەرم دانەویوە بە سەر ئەژنۆم خۆی دا، وە خوێن وەك سەرچاوەی ئاو لە چاوەکانمەوە سەری کردووە.

ب: واتە: ئاخ و دەرد بە ئەندازەیەك ڕووناکی چاومی کەم کردووە، لەوانەیە ڕۆژی ڕووناکم لێ ببێ بە شەو و هەشت ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر نەمێنی لە ناو پێنج فەرزەکاندا، چونکە بە شەوا تەنیا نوێژی مەغریب و عیشا و بەیانی هەیە، ئەو دوو نوێژەکە هی ڕۆژن، کە ڕۆژ نەما خۆ دیارە وەختەکان ناگوێزرێتەوە بۆ شەو.)

سەرچاوە: (دیوانی مەولەوی/ ل)

یـــــەك و دوو فەردم وەخـــــاتر یـاوان دیـــــــەنم لە دیـــوان مەعنا شکاوان

سەهلەن سا ئەگەر مـــــــــەعناش بزانی بنـــــووسی جـــــــواو ماتڵ نەمانی

میـــــــرزام زیادەن، میـــــرزام زیادەن میـــــــرزام ئەر عـــــەقڵت ماچی زیادەن

یە چ گوڵێ وەن لە خـــــــار ئیجادەن؟ گـــــــولەن یـــــا گوڵچین ئادەمیزادەن؟

هەر کەس پاش وەتۆی ئـــەو خارە وەردەن ئـــــەوەڵ مەزانـــــۆ گوڵ کارش کەردەن

سەفـــــاشەن وەلێ ئـــــەرچی خار زشتەن حەق بە لـــــوتف وێش ئەو گوڵ سرشتەن

جەفای خار ماچی ســـــەفای گوڵ گەشتەن گوڵ ماچی حـــوورە و خار چون بەهەشتەن

وەڵگ گوڵ لە تـــــەرح تای خەیاتەی شار کە چـــــەن چون ئەقرەو پێچەن چون شامار

خـەت چین چین ئاران هەر چـینیٚ سەد تار | تـــاریٚ سەد ئەفعـی، ئەفعی بیٚ سەد مار
هەر ماریٚ سەد گاز هـــەر گازیٚ سەد نیش | هەر نێشیٚ سەد دەرد هەر دەردیٚ سەد ئێش
هەر یەك لە سەد لا دڵ گـەستەن پەی وێش | دڵ لە سەد لاوە زووخـــــاو مەیۆ لێـــش
سەهلەن سا ئـــەگەر مەعنــــاش بزانی | بنـــووسی جــــــواو ماتڵ نـــــەمانی
مــیرزام جەو بـــــۆنۆ نەمـــــانی خجڵ | ئەگەر مەپـــــەرسی ئەسـڵ مەعنی گوڵ
هەشت سەر دوو گەردەن دە سینە دوو نـاف | با لێـــت حاڵی وێـت پەنج پاس بی خیلاف
سا میرزام ئـــــەگەر مـــــەعنا شـــکافی | بـــــە وێت مەنـــــازی ماچان سەرڕافی
حەل بکەر پەرێم ئـــــی ئوقدەی مـوشکڵ | وەلێم حاڵی کــــە ئەسڵ مەعنــــای گوڵ
وە زەرب و تەقسیم وە جەمع و تــــەفریق | حـــــــەساوش بکـــــەر لە راسی رەفیق
ئەعدادش وە یـــــەك بکەر شــــــمارە | لێت مەعلووم مەبــــــۆ ئەو گوڵ و خارە

(وەڵامی موعەمما لە دێڕی چاردەمین دایە:

هەشت سەر: ٨=ح | دوو گەردەن: ٢=ب
دە سینــە: ١٠=ی | دوو نـــاف: ٢=ب

پێنج پا: ٥=هـ (حەبیبە)

حەبیبە دڵداری شاعیـــــرە کە ئەتوانیٚ | دڵدارێکی مەجازی بیٚ یان راستەقینە)

سەرچاوە: (دیوانی نەسیمی شاهۆ - میرزا ئەحمەدی موحەممەدی داواشی رەوانسەری)

♠♠♠

بڕێك لە شیعری شاعیران هەیە کە تایبەتمەندی و نیشانەی مەتەڵیان تێدایە. ئەمانە وەك مەتەڵ نەکەوتوونەتە سەرزبانی خەڵکەوە و ئەتوانین بە جۆرێك مەتەڵی شاعیرانە ناویان لێ ببەین یان بە گۆڕانێك لە دەقەکانیاندا ئەتوانین مەتەڵیان تێدا ساز کەین. بڕێك لەم شیعرانەم بۆ نموونە هێناوە. چون کارەکەی من لەسەر مەتەڵە، تەنیا مەتەڵەکانم نووسیوە و وازم لە باقی شیعرەکان هێناوە.

-١

باغچەی جوانی سروشتم　　بەروانە دەور و پشتم
هاژەی قەڵبەزەی ئاوم　　ڕووناکییە بۆ چاوم
وەرزی سەیران و گەشتم　　لە شاخ و کێو و دەشتم

(بەهار)

سەرچاوە: (کاکەی فەلاح/ جگەرگۆشەکان/ ل٥٢)

-٢

بۆیە ئەو ڕۆژەم پێ خۆشە　　هەموو کەس دڵی خۆشە
خۆشەویستی ئەهێنێ　　تۆوی ئاشتی ئەچینێ

(جەژن)

سەرچاوە: (جەژن) (کاکەی فەلاح/ جگەرگۆشەکان/ ل٤٣)

-٣

منم باران ئەهێنم　　تۆوی زۆر دائەچێنم
باران زۆر ئەبارێنم　　تا کاتی پەڵە دێنم
ئاوی کانی زۆر ئەکەم　　وەك ئاڵتوونە گەڵا کەم

(پاییز)

سەرچاوە: (کاکەی فەلاح/ جگەرگۆشەکان/ ل٥)

